(انجمن ا محمد ا غنی)

# پینچ پایہ کانی ئسلام

چاپی یہ کہم

عبدالعزیز چارہ زانی

را یناوہ

(انجمن ا محمد ا غنی)

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایش هەر بۆ خوای پەروەردگارە و بە هەزاران درووود بێتەخوارەوە بۆسەر گیانی پاکی پێغەمەری خوا و بۆ سەر گیانی یارو یاوەرو شوێن کەوتوەکانی هەتا هەتایە ..

## سەرەتا

فەرموودەیەکی پێغەمەری خوا « درووودی لە سەربێ » بەناو موسڵمانەکانا بڵاوبوەتەوەو شوورەتی پەیاکردوە بەرادەیەك کەبەدەگمەن رێ نەکەوێ مامۆستا ئاینیەکان هەمو جارێ لەکاتی ئامۆژگاری ئاینیدا نەیهێنن و باسی نەکەن ، وەبەشی زۆری نەخوێندەوارەکانیش ئەیزانن و رەوانیان کردوە ، وەفەرموودەکەیش بە فەرموودەی (أرکان) بەش و پایەکانی ئیسلام ئەناسرێ ، وەبە زۆر واتە لە پێغەمەرەوە گێڕراوەتەوە کە ئەمە یەکێکیانە و بوخاری و موسلم دەریان هێناوە و گێڕراویانەتەوە کە پێغەمەری خوا « درووودی لەسەر بێ » فەرموویە :

( بني الاسلام على خمس : شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول

الله وإقامة الصلاة ، وإيتاء الزكاة ، وصوم رمضان ، وحج البيت من استطاع إليه سبيلا ) . واته ئیسلام دارێژراوه له سەر پێنج پایه : شایەتی‌دان کە بێجگە لەخوا کەس شایانی پەرستن نیه و محمد ڕەوانەکراوی خوایه وەکردني نوێژو زەکات دان و ڕۆژوگرتن و حەج کردنه بۆ کەسێ توانای بێ .

ئەم فەرمووده شیرینه ــ وەکو خۆي ئەڵێ ــ بەکورتی ئیسلام‌و پایەکانی ئیسلامي تیا دانراوه ، وەماناو مەبەستێکی زۆرو بە لێشاوی هەیه ، وەئیستا نەبه نوسراو وەنه بەوتار نەم دیوه و نەم بیستووه کەس بە درێژی دەمی بۆکوتایێ وکاکڵه و نهێنیەکانی خستبێته ڕوو له سەری ڕۆیشتێ ، وەئەمەیش زۆر بەپێویست ئەزانم هەتا زۆر لەموسڵمانەکان وانەزانن : کە ئەگەر ئەم پێنجه یا هەندێکیان هەروەها بە سادەیی و بە دیمەن و بەڕوت و قوتی بەجێ بێنن ئیتر بەتەواوی ئیسلامەتی‌یان بە جێ‌هێناوەو دەرگاکانی بەهەشتیان له سەرخۆیان کردوەتەوەو له هەر کامەوه بیانەوێ ئەچنه بەهەشتەوه و دەرگاکانی دۆزەخیان لەسەرخۆیان داخستوه ، وەپێویستیان گیرراوه لەسەر خواي گەورەو پەروەردگار کە لەهەر دوو جیهانا سەربەرزیان بکاو ڕزگاریان بکات ، وەئیتر لەبەرا بەری ئاینەوه هیچیان بەسەرەوه نەماوه . خۆ بێگومان ئەمەیش زۆر هەڵەیه و له ڕاستیەوه دووره .

لەبەر ئەمە - پشت بەخوای میهرەبان - ئەمەوێ هەندێ باسی لێ بکەم ، وەبەپێی توانام راڤەی بکەم [1] ، خۆ ئەگەر نەیش توانم بکەمە بنك و قولایی‌یەکەی ئەوەندە دەرئەبڕم کەبەو شێوە و سادە رەنگی‌یە ئیسلام تەواونابێ ، وەئیسلام زۆر لەوە بەرزتر و گەورەتر و فراوانترە .

چۆن وانیە ؟ خۆ ئیسلام یەکەم بیرو باوەڕ « مبدأ »ە لەجیهانا وەتاقە بەرنامەیەکی ئەوتۆیە کەئەتوانێ بەخۆشی و ئاسایش و بەختیاری یەوە مرۆڤ - بەهەموو بەشەکانیەوە - بەرێ بەرێوە و هەموو ئیش و کارەکانی بۆ جێبەجێ بکات بەبێ‌کەم و کورِی یا تێك‌چوون و شێواوی بەڵکو لەچوارچێوەی برایەتی و دۆستایەتی‌یا شان بەشانی کاروباری ئەو جیهانی ، ئیش‌وکاری ئەم جیهانەیشی بۆ رێك بخات . « وما أرسلناك إلا كافة للناس »[2] : یانی تۆمان ناردووە بۆهەمو مرۆڤێ بەپێغەمەریتی « وأرسلناك للناس رسولاً »[3] : یانی تۆمان ناردووە کە پێغەمەری هەموو مرۆڤێك بی . « إن الدين عندالله الاسلام »[4] : یانی ئایین و بەرنامە بەلای خواوە هەرئیسلامەو بەس . « ومن يبتغ غير الاسلام ديناً فلن يقبل منه »[5] : یاني هەرکەسێ بێجگە لەئیسلام هەربەرنامەیەکی‌تر

---

١) راڤە : شەرح . ٢) السبأ ٢٨ . ٣) المائدة . ٤) آل‌عمران ١٩.
٥) آل‌عمران ٨٥ .

بۆخۆی دابنێ یا شوێنی بکەوێ لێی وەرناگیری .

وەدیسان ئەو هەمو ئایەت و فەرمودانەی باسی حوکم و فەرمان ڕەوایی و حدود و باسی یاساو ڕژێم و نەریت و باسی کۆمەلایەتی و ئابووری و ڕامیاری و باسی پەیوەندی و ڕابەدەستەکانی مرۆڤەکان و باسی جەنگ و هەراو ئاشتی و پەیمان و باسی زانیاری و خوێندەواری و .. هتد ئەکەن چۆن ئەبێ ئەمانە لە ئیسلام نەبن و ئیسلام ئەمانەی تیا نەبێت ؟ یا کەسێ گوێ نەدات بەمانە ئەبێ هەڵوێستی لە ئیسلاما چۆن بێ ؟.

بێگومان ئەو باوەڕە ڕاستنیە ، خۆ ئیسلام بریتیە لەوەی کەوا پیغەمبەر لە لای خوای پەروەردگارەوە هێناویەتی وەئەمانیش کاکڵەی ئیسلامن بەم مانایە .

## فەرمودەکە دوو ڕوی هەیە :

ئەتوانین بە دوو جۆر مانای ئەو فەرموودەیە لێك بدەینەوە : یەکەم : مەبەست بەوە کە ئیسلام ئەم پێنجەیە وەکو لە فەرمودەیەکایە ـ یا لە سەر ئەم پێنجە داڕێژراوە ـ وەکو لە فەرمودەکەی بەر دەسمانایە ـ ئەمەیە ئیسلام ئەمانە زۆر بەگرنگ سەیر ئەکا وەهەتا ئەوەندە گرنگن ئەڵێی تەواوی ئیسلامەتی ئەمانەن ، چونکە ئەمانە زۆر گەورەن وەپێویستی

سەر شانی هەموو موسلمانێکن بە مەرجێ توانایی بێ .

وێنەی ئەمە زۆرە لە فەرموودە وەلە ئایەتیشا ـ موسلم و بوخاری ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبو هریرە « خوا لێیان ڕازی بێ » کە پێغەمەر « درودی لە سەر بێ » فەرموویە : « کە ئیمان و باوەڕ حەفتاو ئەوەندە ـ یان شەستو ئەوەندە ـ بەشی هەیە : گەورەکەیان « لا إله إلا الله » یە ، وەبچوکەکەیان لابردنی خراپەیە لە ڕێی مەردما وەشەرم بەشێکە لە باوەڕ » .

دەی دیارە مەبەست بەمە لقو پۆپو سوودەکانی باوەڕە ئەگینا خۆ وا باوە کە باوەڕ خۆی شەش بەشی هەیە . وەلە هەندێ فەرموودەدا ئیسلام ئەکات بە چەند بەشەوە وەکو باوەڕ لەم فەرموودەدا .

دووەم : ئەبێ بە جۆرێ لەم فەرموودە بدوێین کە هەموو بەشەکانی ئیسلام کە پێغەمەر لە لای خواوە هیناویەتی بیگێڕینەوە بە هەموو پارچەو بەشەکانی‌یەوە بە ووردو درشتی‌یەوە ، وەپشت بە خوای گەورە لە باسەکەدا بە ڕۆشني بۆت دەر ئەکەوێ .

## پایەی یەکەم لە ئیسلاما

# شـــایەتمان

فەرموودەکەی پێغەمەری خوا « درووودی لەسەربێ » بۆ یەکەم پایەی ئیسلام شایەتمان : « أشهد أن لا إله الا الله وأشهد أن محمداً رســـول الله » ی داناوە . بۆ ئەوەی لە مانای ئەم پایەی یەکەمی ئیسلامی‌یە تێبگەین ئەبێ مانای یەکە یەکەی ووشەکانی وەمانای ڕستەکە بەووردی لێك بدەینەوە :

مانای ووشەکان : « أشهد » یاني شایەتی ئەدەم ، واتە لەم ووتەیەما دڵو زوبـانم وەکو یەکـەو دڵو دەروونم پڕە لە باوەڕ بەڕاستی واتەکەم نەك بە دەم بیـلێمو دڵم باوەڕی بە جۆرێ تربێ .

« إله » ئەم ووشەیە لە کاتي هاتني قورئانا بۆسەر محمد « درووودی لە ســـەربێ » لە زوبانی عەرەبەکانا بە چەند مانایەك بەکار ئەهێنرا وەئیسلام ئەم مانایانەی ـ هـەموویان ـ بڕی بەسەر خوادا وەئەوانەی « إله » یان بە هەرکام لەوانە بۆ غەیری خوا دا ئەنا قورئان بە بت پەرست و هاوەڵ « شریك » بۆ خوا دانەری دا ئەنان .

ئەو مانایانە :

١- پشتیوان و کۆمەك و بەهاوارەوە هاتوو لە کاتی تەنگ و چەڵەم و پێگیرانا « واتخذوا من دون الله آلهة ليكونوا لهم عزا » [١] یانی بێجگەلە خوا چەند خوایەکیان بۆ خۆیان داناوە تا ببنە کۆمەك و پشتیوانیان « واتخذوا من دون الله آلهة لعلهم ينصرون » [٢] بێجگەلە خوا چەند خوایەکیان بۆ خۆیان داناوە بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە سەرکەون وزاڵ بین .

٢- شفاعەت خوازو تکاکەر بە شێوەیەك کە دەستەڵاتیکی ئەوتۆی لە گەلابێ نەتوانرێ تکاکەی لێ وەرنەگیرێ ، وەبتوانێ مەبەستەکەی خۆی بەجێ بێنێ وسوود بە شوین کەوتووەکانی بگەیەنێ « أ أتخذ من دونه آلهة إن يردن الرحمن بضر لا تغني عني شفاعتهم شيئاً ولا ينقذون»[٣] ئایا بێجگەلە خوا چەندخوایەکی‌تر بۆخوم‌دابنێم کەئەگەر خوای‌مهرەبان بیەوێ زیانم پێ‌بگەیەنێ تکاکردنی ئەوان هیچ سوودم پێ‌ناگەیەنێ و رزگارم ناکات .

« والذين اتخذوا من دونه أولياء ما نعبدهم الا ليقربونا الى الله زلفى إن الله يحكم بينهم فيماهم فيه يختلفون » [٤] واتە ئەوانەی بێجگەلە خوا چەند گەورەیەکیان داناوە ئەڵێن بۆ ئەوە ئەیان پەرستین

١) مريم ٨١ . ٢) يس ٨٤ . ٣) يس [illegible] . ٤) الزمر ٣.

له خواوه نزیکمان ئه‌که‌نه‌وه ، خوا حوکم ئه‌کات له ناویانا له وشته‌ی تیایانا ڕیکن « ویعبدون من دون الله مالا یضرهم ولا ینفعهم ویقولون هؤلاء شفعاؤنا عند الله ١ » یانی بێجگه‌له خوا شتیوا ئه‌په‌رستن نه‌زیانیان لێ ئه‌ده‌ن و نه‌که‌ڵکیان پێ‌ئه‌گه‌یه‌نن وئه‌ڵێن : ئه‌وانه تکاکارمانن له لای خوا .

٣ـ زیان به‌خش‌و سامناك و خاوه‌ن ده‌سته‌ڵات به سه‌ر هه‌رکه‌سا لێی بره‌نجێن وبتوانن ئازاری بده‌ن وتوشی بکه‌ن « وقال الله لا تتخذوا الهین اثنین انما هو اله واحد فایای فارهبون ٢» خوا ئه‌فه‌رموێ : دوو خوا مه‌گرن خوا هه‌ر یه‌که‌و نابێ به دوو وه‌هه‌ر له من بترسن « ولا أخاف ما تشرکون به إلا ان یشاء الله ٣ » من ناترسم له‌وه‌ی ئه‌ی که‌ن به هاوه‌ل بۆ خوا که زیانم پێ‌بگه‌یه‌نێ مه‌گه‌ر خوا مه‌یلی بێ « ان نقول الا اعتراك بعض آلهتنا بسوء ٤ » ئێمه ئه‌ڵێن : ئه‌ترسین هه‌ندێ له خواکانمان تووشی ناخۆشیت بکات .

٤ـ دانه‌ری شه‌ریعه‌ت و نه‌ریت و یاساو به‌رنامه‌و پرۆگرام بۆ ژیان و بۆ کاروباری خه‌ڵکی . « إتخذوا أحبارهم ورهبانهم أرباباً من دون الله والمسیح إبن مریم وما أمروا إلا لیعبدوا إلهاً واحداً لا إله إلاهو». [٥] : یاني گاوره‌کان زاناو ڕوهبانه‌کانیان کردووه به‌خوای خۆیان

١)یونس١٨ . ٢) النحل٥١ . ٣) الانعام٨٠ . ٤) هود ٥٤ . ٥)التوبة٣١

بێجگە لەخواو عیسای کوڕی مریم ، وەفەرمانیان پێدراوە کە هەر تەنها خوایەك بپەرستن وبێجگە لەو خوایەکی‌تر نیە . «وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لكثير من المشركين قتل أولادهم شركاؤهم »١ . : یانی زۆر لەشەریك و هاوەڵ دانەرەکان ئەو هاوەڵانەی بۆ خۆیان دانابو ، منالّ و ڕۆڵە کوشتنی خۆیان بۆبە جوان دانابوون. « أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين مالم يأذن به الله »٢ ؟. واتە : ئایا ·هاوەڵی وایان هەیە کەبتوانێ لەئاینـا شەرع و قانونی وایان بۆدابنێ کە خوارێی نەدابێ ؟ .

٥- شوێن کەوتوو لەگەڵا ڕۆیشتوو هەرچۆنێ بیەوێ . « أرأيت من أتخذ الهه هواه »٣ : یانی ئایا ئەوانە ئەبینی کە هەواو ئارەزوی خۆیان کردووە بەخوای‌خۆیان . واتە هەر شوێنی ئارەزوویان ئەکەون وەووشەی «رسول» یانی نێرراوو فورستادە و ئیشی گرنگ پێسپێرراو بەمەرجێ لەگەیاندنی پەیامەکەیا ڕاست و ئەمین و بێ‌خیانەت بێ .

**مانای شایەتمان :**

لەم لێك‌دانەوەی پێشەوە دەرکەوت کە مانای شایەتمان ئەمەیە : شایەتی ئەدەم : بەدەم ئەڵێم ودڵم پڕە لە باوەڕ کە بێجگە لە خوای پەروەردگار هیچ کەس و هیچ شتێکی‌تر خوانیە ، واتە پشتیوان و

١) الانعام١٣٧ . ٢) الشورى٢١ . [illegible] الفرقان ٤٣ . .

کۆمەك و بەهاوارەوە هاتوو پەرستراوو خاوەنی دەسەلات بەسەر زیان یا کەلکاو تکاکەر لەگەڵ دەسەلاتی بەجێ هێنا ناو دانەری شەریعەت و یاساو بەرنامە و پرۆگرامو شوێن کەوتوی راستەقینە لەهەمو روویەکەوە هەر تەنیا خوای تاك و تەنیایە و ئەمانە هەر بۆ خوا هەن و بەس، وە[محمد] رەوانەکراوی خوایە بەپەیامەکەیەوەو هەرچی فەرمووە لە خواوەیەو بەس ، وەمن هەر لەوەوە ئایین و بەرنامە وەرئەگرم .

وەبە ووردبوونەوە و سەرنجدان لە قورئانی پیرۆز بۆمان دەرئەکەوێ کە خوای گەورە لە باسی ئیسپات کردنی خوایەتی خۆیا و لە بەدرۆ خستنەوەی ئەو کافرانەی بتیان بە خوا دائەنا لەم باسەدا چەند کردەوەیەك ئەکا بەبەڵگە لەسەر خوایەتی خۆی وەکافرەکانی پێدەم کوت ئەکا ، ئەمەیش وائەگەیەنێ کەئەو جۆرە کردەوانە هەر بۆخوا هەن و نابێ بدرێن بەشانی کەسی‌ترا ، هەرکەسێ ئەمانە بۆغەیري خوا دابنێ ئەوەکافرەو شەریك و هاوەڵی بۆخوا داناوە .

ئەوانەیش وەکو پەرستراوی : « وهو الذي في السماء إله وفي الأرض إله ١ » خوا ئەوەیە کەلە ئاسمانا پەرستراو وەلەزەوی‌دا پەرستراوە وەپەروەرش کردن و پێگەیاندن « الحمد لله رب العالمين ٢ » سوپاس هەر بۆ خوایە کە پەروەرش کەرو پێگەیەنەری هەموو جۆرەکانی

١) الزخرف٨٤ . ٢) الفاتحة١

گیتی‌یه . وه‌دروست کردن « أفمن يخلق كمن لا يخلق أفلا تذكرون ١»
یانی ئایا ئه‌وه‌ی دروست که‌ربێ وه‌کو ئه‌وه‌یه نه‌توانێ دروست بکا ؟
ئایا بیر ناکه‌نه‌وه ؟ وه رِزق و رِۆزی دان و نیعمه‌ت پێ‌به‌خشین « يا ايها
الناس اذكروا نعمة الله عليكم هل من خالق غير الله يرزقكم من السماء
والأرض لا إله إلا هو فأنى تؤفكون ٢ » . ئه‌ی مرۆڤه‌کان بیر که‌نه‌وه
له نازو نیعمه‌ته‌کانی خوا به سه‌رتانه‌وه ئایا بێجگه‌له خوا دروســـت
که‌رێکی‌تر هه‌یه که رِزق و رۆزیتان بداتێ له ئاسمان و له زه‌وی‌دا ؟
بێجگه له‌و خوایه‌کێ‌تر نیه له کوێ ئه‌و درۆیانه رِێك ئه‌خه‌ن ؟ ( قل
أ رأيتم إن أخذ الله سمعكم وأبصاركم وختم على قلوبكم من إله غير الله
يأتيكم به ٣ ) یانی : بڵێ ئایا : ئه‌بینن ئه‌گه‌ر خوا گوێ‌و چاوتان لێ
وه‌ربگرێته‌وه وه مۆر بنێ به سه‌ر دڵتانا بێجگه‌له خوا کێ خواتانه‌و
ئه‌مانه‌تان بۆ دێنێت ؟ یا وه‌کو هێنان و گێرانی شه‌وو رِۆژو تاریکی‌و
رِوناکی‌و دروست کردنی ئاسمانه‌کان و زه‌وی‌و رِێك خستنی شه‌و رِۆژو
دروست کردنی ژێر بار خستنی رِۆژو مانگ و ئه‌ستێره‌کان ، یا وه‌کو
دروست کردنی ئاده‌میزادو هه‌موو جۆره گیان له به‌رو بێ‌گیانێکی زه‌مینی
وهه‌وایی‌و ئاوی‌و رِێك خستنی به گوێره‌ی پرۆگرامێکی ئه‌وتۆ که هه‌موو
زانایه‌کی تایبه‌تی تیایا سه‌رسامه . وه‌هێنان و گێرانی هه‌ورو باو رِێژانی

---

١) النحل١٧ . ٢) فاطر٣ . ٣) الانعام٤٦

بەفرو باران ، یا وەکو ڕێك خستنی شەریعەت و یاساو ڕژێم و بەرنامەی گیتی بە شێوەیەکی پڕ سوودو ناوازە ، یا وەکو مراندن و زیندو کردنەوە یا وەکو ئاگاداریو بیستن و بینین و زانینو . . . هتد .

وە بەڵگەی ئەمانە لە قورئان و فەرموودەدا ئەوەندە زۆرە پێویستی بە باس کردن نیە ، یا وەکو حوکم و فەرمان و فەرمان ڕەواییو کار بە دەستیەتی ( إن الحكم إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ١ ) یانی بێجگەلە خوای گەورە حوکم و فەرمان ڕەوایی بۆ کەسیتر نیەو نابێ خوا فەرماتی داوە کەهەر تەنها ئەو بپەرستین (یانی شوێن حوکمی ئەو بکەون وبەس) ئەمە کە حوکم هەر بۆ خوایێ ئاینی ڕاستە قینەیە .

( أفحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن من الله حكماً لقوم يوقنون ٢ ) ؟ یانی ئایا حوکمی نەفامێتیيان ئەوێ ؟ ئایا ئەبێ حوکم وفەرمانی کێ لە هیني خوا جوانتر بێ ئەگەر ڕاست ئەکەن موسڵمانن وباوەڕیان هەیە ؟ بێگومان هینی کەس ناگاتە هینی خوای گەورەو پەروەردگار چ جای جوانتری .

[ ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا

---

١) يوسف ٤٠ . ٢) المائدة ٥٠

به ١ ] واته ئایا سەیری ئەوانە ناکەی کە وا پیشان ئەدەن باوەڕیان هێناوە بەو قورئانەی بۆ تۆ هاتووەو بە کتێبە پێشووەکانیش کەچی ئەیانەوێ بچنە ژێر حوکم و فەرمانی ( طاغوت )٢ وەداوایان لێ کراوە باوەڕیان پێی نەبێ و نەچنە ژێر فەرمانی یەوە .

وەلە دوای ئەمە ئەفەرموێ : ( فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجاً مما قضيت ويسلموا تسليماً ٣ ) یانی نەء وا نیە ، بە خوای تۆ قەسەم ئەی ( محمد ) موسڵمان نین هەتا وایان لێ نەیە کە تۆ بکەن بە حاکم و کار بەدەست لە ئیش و کارەکانیانا وەکە تۆش حوکمت بۆ دەرکردن دڵیان هیچی تیا نەمێنێ و بە تەواوی گەردنیان کەچ بکەن ، وهەزاران شتی تری لەم وێنەیە . خوای گەورە ئەمانە ئەکا بە بەڵگەو بورهان لە سەر خوایەتی خۆی بە تەنیا ، وە ڕەدی خوایەتی هەموو کەسێ یا شتێکی تریان پێ ئەکانەوە ئاشکرایە ئەبێ ئەم جۆرە شتانە وەسفی خاص و تایبەتی خوابن وە بێجگەلە خوا ئەمانە بۆ هیچ کەس یا هیچ شتێکی تر نەبن . وەدیسان ئاشکرایە هەر کەس هەرچی یە لەمانە بۆ غەیری خوا دابنێ ئەوە ئەو

---

١) النساء ٦٠ . ٢) طاغوت : ووشەیەکە بەکار ئەهێنرێ بۆ هەموو شوێن کەوتوو پەرستراوێك بێجگەلە خوا ، ئیتر مرۆڤ بێ یا هەرشتێکی تر .
٣) النساء ٦٥ .

غەیرەی بە خوا داناوەو شەریكو هاوەڵی بۆ خوا داناوەو موسلمانێ یا بە هەزاران نوێژو ڕۆژووو پەرستنی تری هەبێ، وە ئەو هەژارە سەری لێ تێك چووەو گومڕایە .

کەواتە هەر کەسێ داوای پشتیوانیو کۆمەکی لە هەر کەسێ بێجگەلە خوا بکا ، یا لە کاتی پێگیرانیا هاوار لە هەر کەس بکاو بە تەمای بێ کەڵكو سوود یا بترسێ زەرەرو زیانی پێبگەیەنێ، یا باوەڕی بە ڕاستی شەرع و قانونو یاسای هەر کەسێ یا هەرچینێ بێ، یا شوێنی بەرنامەو پرۆگرامی هەر کەسێ یا هەر لایەك بکەوێ ، یا ڕازی بێ بە حوکم و فەرمان ڕەوایی هەر کەسێ کە بە پێی یاساو دەستووری ئیسلام نەجوولێتەوە ، یاوا بزانێ ڕزقو ڕۆزی یابەرزيو نزمی یاسامانو منالیا لەش ساغی و تەمەن درێژی و.. هتد . لە هەر کەسەوە ببینێ ، یاوا بزانێ فلانە کەس غەیب زانەو هاواري لێ بکا بە هاواریەوە دێت وئاگای لێیەتی وەدێت بە دەنگیەوە ، یا شوێن کەوتنی تەواوی بۆ هەر شتێ یا هەر کەسێکی تر بێ ـ بێجگەلە خواو لە ئایینەکەی ـ یا ئامانجی لە ژیانیا هەر پێك هێنان یا خزمەت کردنی هەر شتێکی تر بێ .

هەر کەسێ بەم پێیەی سەرەوەبێ ئەوە بت پەرست و موشریکە وهاوەڵی بۆ خوای تاكو تەنیـا داناوەو ئەوە کافرەو باوەڕی بە خوا دانەمەزراوە یا بە هەزاران پەرستني جۆر بە جۆری بێو خۆی بە هاوەڵ

هاومالێ ئەبو بەکرو عومەرو عوسمانو عەلیش بزانێ . و

بەلام مرۆڤێ موسڵمانی ڕاستەقینە هەربەتەنیا خوا ئەناسێ و پاڵ بەخواوە ئەدا و هەموو شتێکی هەر لەوەوە ئەبینێ و چاوەڕوان ئەکات وەهەر لەو ئەترسێ و هەمیشە چاودێری ئەکاو ئاگای لێیەتی .

مرۆڤێ موسڵمان کە ووتی « لا إله إلا الله » مەبەستی ئەوەیە پەرستراوو شوێنکەوتوی ڕاستەقینە هەرخوایەو بەس ، وەهەموو ئەو شتانەی قورئان و فەرمودە کردونی بەخەسایس و وەسفی تایبەتی بۆ خوای گەورە هەموویان هەر بۆ خوا دائەنێ و نایاندا بەشانی کەسیترا وەهەرچی لەمە لابدا بە کوفرو بێئایینی دائەنێ .

وەکە ووتی « أشهد أن محمداً رسول الله » باوەڕی وایە کە محمد پێغەمەرو ڕەوانە کراوی خوایە و خوای گەورە لە ناو مرۆڤەکانا هەڵی بژاردووە باری پەیام و پێغەمەریتی داوە بە سەریاو ئەویش بە ئەمینیو ڕاستیو بە بێ خیانەت گەیاندوویەتی بە مەردوما ، وەپێغەمەر نوێنەری خوا بووە لە سەر زەوی داو پەیڕەوی ئەو پەیڕەوی خوایە « من یطع الرسول فقد اطاع الله ١ » هەر کەسێ پەیڕەوی پێغەمەر بکا ئەوە پەیڕەوی خوای کردووە .

---

١) النساء ٨٠ .

## گەڕانەوەیەك بۆ سەر ماناي شایەتمان :

وتمان بەشی یەکەمی شایەتمان بریتی‌یە لەتاك و تەنیایی خوا لە هەموو کارو بارێکا وەئەم تەنیایی‌یەی لە سێ مەیدانی گرنگا ئەدرەوشێتەوە:

١ـ لە مـەیدانی باوەڕ [ العقیدة ] دا « والهکم إله واحد لا إله الا هو الرحمن الرحیم ١ » واتە خوای ئێوە تەنیا یەك خوایەو بێجگە لەو خوایەکی تر نیەو ئەو خوایە بەخشندەو میهربانە « وقال الله لا تتخذوا إلهین إثنین إنما هو إله واحد فایای فارهبون ٢ » یانی خوا ئەفەرموێ : دوو خوا مەگرن خوا هەر تەنیایەو لەو زیاتر خوایەکی تر نیەو هەر لە من بترسن .

٢ـ لە مەیدانی پەرستن‌و پەرستنا « قل ان صلاتی ونسکی ومحیای ومماتی لله رب العالمین لا شریك له وبذلك أمرت وأنا اول المسلمین٣ » واتە ئەی پێغەمەر بڵێ نوێژ کردنم و پەرستنەکانی ترم و ومردنم وژیانم هەر بۆ خوایەکە پەروەرش‌کەری هەموو بەشەکانی گێتی‌یە ئەو خوایە هاوەڵ‌و هاو کاری نیەو ئاوە هام فەرمان پیا دراوە وەمن یەکەم موسڵمانم .

٣ـ لە مەیدانی شـەریعەت‌و بەرنامەدا : بەندەی ڕاقینەی [نسته] خوا

---

١) البقرة ١٦٣ . ٢) النحل ٥١ . ٣) الانعام١٦٢.

نەو هاوەڵو هاو کاری بۆ خوا داناوە ئەو کەسەی شەریعەتو قانون وبەرنامەو پرۆگرام لە یەکێکی ترەوە ـ بێجگەلە خوا ـ وەربگرێ یا لە غەیري ئەو رێگەوە وەری بگریٚ کە خوا بۆی ناردوین کە بریتیە لە ئیسلام و پێغەمەری ئیسلام ـ وەکو بەشی دووەمی شایەتمان ئەی گەیەنیٚ « أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله ١ ».

« وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا »٢ . واتە : ئەوەی کە پێغەمەر داینیٚو بۆیدانان وەریبگرن و ئەوەیش گێڕانییەوەلیٚی لیٚیبگەڕێنەوە« عەدی کوڕی حاتەمی تەی ئەگێڕێتەوەئەڵیٚ: هاتمە خزمەتي پێغەمەری خوا (د) وەئەوکاتە گاوربووم ، ئەویش ئەم ئایەتەی خوێندەوە « اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أرباباً من دون الله »٣ . منیش ووتم : کوا؟ چۆن ئەوان زاناو ڕوهبانیان بە خوا ئەزانن ؟. فەرموی : « ئەوانـــە حەڵاڵیان بۆ حەرامو حەرامیان بۆ حەڵاڵ ئەکەنو ئەمانیش پێی ڕازین ئەمەیە بەخوا دانانیان » واتە : شەرع و قانون و بەرنامەدانان تەنها بۆ خوایە ، وەهەرکەس ئەمەی کرد خۆی کردووە بـەخوا وەشـوێن کەوتووەکانیشی هاوەڵدانەرو کافرن .

لە هەر شوێنێکا یەکیەتي و تەنیایی خوا لەم سیٚ٣ مەیدانەدا هاتەجیٚ

---

١) الشورى ٢١ ٢) الحشر ٧. ٣) التوبة ٣١.

ئەوە کومەڵی موسڵمان پێك هاتووە ، وەلەهەرکوێیەکا ئەم سـیانە یا هەندێ لەم سیانە نەهاتەجێ ئەوە ئیسلامەتی نیە ، چونکە پایەی یەکەمی ئیسلام کە شایەتمانە بەجێ نەهاتووە .

کۆمەڵی موسڵمان پەیانابێ هەتا تاقمی خەڵك هەڵنەسن کە بەندایەتی ڕاستەقینە بۆ خوای تاك و تەنیـا دابمەزرێنن لەم سێ ٣ مەیدانەدا وەکو ووتمان ، ئەنجا دەست بکەن بەرێك خستني ژیانیان لەسـەر ئەم بناغەی بەندەیەتی ڕاستيیە بۆ خوای تەنیا ، وەباوەڕ و پەرستن و یاسایان پاك بکەنەوە لە غەیری خوا .

ئا لەم کاتەدا کۆمەڵی موسڵمان پەیدا ئەبێ ، وەئەو ووڵاتەیە ووڵاتی ئیسلام ، بەڵام پێش ئەمە نەکۆمەڵ ئیسـلامیيە، وەنەووڵاتیش ئیسلامیيە وەپێویستە بەم پێیە کومەڵی ئیسلامي دروست ببێتەوە .

دیسان شتێکی سروشتيیە و گومانی تێدانیيە کە باوەڕی ئاوەها ئەبێ پاڵ بە مرۆڤەوە بنێ بۆ تێکۆشـان و خەبات کردن لە پێناوی دامـەزراندنی ژیان لەسەر ئەم بنچینەیە ، وەبۆ پێك هێنانی کۆمەڵی ئیسلامی وەجێبەجێ کردنی ئەو شتانەی کەئیسلام داوایان ئەکات بە شێوەیەکی گشتی هەتا خوای لێ ڕازی بێ ببێتە موسـڵمان ، وەناگونجێ خاوەنی ئەم باوەڕە بتوانێ بەسستي و تەمەڵی دابنیشێ و کەم تەرخەمی

بکاو بحەویتەوە ، وەپێغەمەریش «د» ئەفەرموێ :

( باوەڕ بەئاوات خواستن و هەناسە هەڵکێشان پەیانابێ ، بەڵکو ئەوەیە لە دلا جێی‌خۆی بکاتەوەو کردەوەیش دەری بخا ) .

وەبەم مانایە پێغەمەر ئەی‌فەرموو : کە سێ بڵێ: ( لا إله إلا الله ) ئەچێتە بەهەشـــت نەك بە شێوەیەکی سادەو بە ووتنێکی دەمی پەتي وەکو هەندێ ئەڵێن .

## ئیشی موسڵمان :

یەکەم ئیشێ کە موسـڵمان بە پێویستی بزانێ پێ‌هەڵسانی بریتیە لەهاتنە سەر ڕوی حاکمێتي خوا بەتەنیا ، وەپێك‌هێنانی ئەو بەرنامەیەی خوای گەورە دای‌ناوە بۆ ژیـانی مرۆڤایەتی بە ڕویـەکی گشتی ، ئەو بەرنامەو پرۆگرامەی کە ئادەمیزادی کردووە بەجێ‌نشـین «خلیفە» ی خوا لەگێتی‌داو ئەیەوێ پی‌بەن بەرێوە ، وەخـستنە ئیشی ئەو یاســـاو دەستورو نەریتـانەی بۆی ڕێکخستوون : لە پەیوەنـدی مرۆڤ لەگەڵ دەروونی خۆیا هەتا ئەگاتە حوکمرانی جیهان‌و بەکارهێنانی هەموو ئەو هێزو ڕواڵەت و ماددانەی گێتی فراوان بۆسوودی مرۆڤایەتی و ئاسـان کردني ژیانیان ( خلق لکم ما في الأرض جمیعاً ) ۱ . واتە : هەرچی لە

---

۱) البقرة ۲۹ .

سەر زەوی‌دایە خوا بۆ سوودو کەڵکی ئێوەی دروست کردووە (ألم تروا أن الله سخر لكم ما في السموات وما في الأرض)١ . ئایا نابینن کە خوای گەورە ئامادە و ژێربار‌ی‌کردوە بۆ ئێوە هەرچی لەئاسمانە کان و زەوی‌دا هەیە. وەخەریك بوون و خەبات‌کردنە لە پێناوی بەرز کردنەوەی ووتە «كلمة» و فەرمانی خوا وەسەرە و ژێرو نزم‌کردنی ووتەی کافرو نەفامەکان، وەتەنها شەریعەتەکەی خوا بەرنامەو دەستوورو یاسای ناو کومەڵ بێ کە جوانترین و بە دادترین و بەرزترینی ئەو شەریعەتانەیە کەوا سەرزەوی دیونی و مێژو ڕێی لێ‌کەوتوە و ڕێی لێ‌ئەکەوێ هەتا هەتایە، وەتێ‌کوشانە بۆئەوەی ئەو بەرنامەیە بەتەواوی سەرزەمین ڕۆشن بکاتەوەو مرۆڤایەتی ڕزگار بکات، وەهەرکەسێ یا چینێ لە ڕێی ئەم شەپۆلەدا بوەستێ بەناچاری بەدەستی پولایین لێ‌ی‌ئەدا، لەبەرئەوە مرۆڤی موسڵمان هەمیشە لە جیهاد و تێ‌کوشاندایە وەهەر خەریکی خوا پەرستی‌یە.

## سوودی باوەڕ :

ئەم باوەڕە دارێژراو ویتەوە ـ بێجگلە لەوێ ڕەزامەندی خوای پەروەردگارو پاشە ڕۆژێکی بەرزو بەختیارانەو کامەرانێکی هەتا هەتایی

١) لقمان ٢٠

وگەیشتن بە بەهشتی بەرین‌و سەرفرازی بۆ موسڵمان پێك دێنێ‌ودەستی ئەخـا ـ ئەبێتە هۆی دامەزراندنی دڵ‌و دەروونی مرۆڤ‌و دڵنیایی و ئارامی دەست ئەخات ، لە دڵە ڕاوکە « قلق » و‌ئاژاوەیی ناودەروون ڕزگاری ئەکات ، ئەو دڵە ڕاوکەیەی ڕۆژاوای تیا ئەژی ، ئەو ئاژاوەیەی دەروون و ئەو دانەمەزراوی‌یەی مێشك و دەماغیان تێك ئەداو تووشی جۆرەها نەخۆشی‌ی دەروونی « نفسی » وڕەوانی‌و دەماغی‌یان ئەكات لە ئەنجامی ئەو زۆران بازیەی لە سەر زەوی ولە ئاسمانایە ، ئەبینن هەموو شتێ لە بەردەم‌و دەورو بەریانا ئەگۆڕێ ، یاسای ژیان‌و ئابووری ئەگۆڕێ ، یاسای ڕامیاری « سیاسی » ئەگۆڕێ یاسای کۆمەڵایەتی ئەگۆڕێ پەیوەندی‌یەکانی نێوان دەوڵەت‌و ئەندامەکانی مرۆڤ ئەگۆڕێ وەشتە ڕاستە قینە زانیاری‌یەکان « الحقائق العلمیة » ئەگۆڕێ ، جا ئەگەر هێزێکی دامەزراو نەگۆڕراو نەبێ کە خەڵکی باڵی پێوە بدەن وپشتی پێوە ببەستن وهـاواری بۆ بەرن لە کاتی شەڕە شۆق‌و زۆران بازی‌یا ندا لە گەڵ ژیان و مرۆڤ‌و شتەکانی تری گیتی‌دا لێرەدا یەك ئەنجام ئەبن‌و بەس ئەویش : نەخۆشینی دڵە ڕاوکەو ئاژاوەیی دەروونە ·

لە بەر ئەمەیە زۆر لە زانا بەرزە ئەوروپایی‌یەکان لە ئەنجامی لێ کۆڵینەوە وتێ‌بینی‌یاندا گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامە کە بیروباوەڕ بە خوای پەروەردگار پێویستی‌یەکی گیانی ودەروونی‌و مێشکی‌یە لە یەك کاتا .

یەکێ لەوانە زانای بەرزی ئاسمانی « جیمس جینز » ە ، ئەم زانایە لە سەرەتای ژیانیا بێ باوەڕو خاوەن گومان بووە بەلام لە ڕێی لێکولینەوەی زانیاری‌یەوە گەیشـــتە ئەم ئەنجامەکە : « گیرو گرفتە گەورەکانی گیتی ناکرێنەوە وەها ناکرێن تەنها بە بوونی خوا نەبێ » .

وەزانای کومەلایەتي بە ناوبانگ ( جیز برج ) بە تایبەتی هاوار ئەکا بۆ ئاییني ئیسلام ، چونکە لە یاسایەکدا ماددەو گیان « المادە والروح » کۆئەکاتەوە وڕیکیان ئەخات .

یا سەیری نووسەری بە باوبانگ « سومر ست موم » بکە کە ئەڵێ « ئەمڕۆکە ئەوروپا خوای لا بردوەو باوەڕی‌بەخوایەکی نوێ هیناوە کە زانیاری‌یە خۆزانیاریش شتێکی گۆڕراوەو ئەمڕۆ ئیسپاتی شتێ ئەکا کە دوێنێ نەفي ئەکردو بە درۆی ئەزانی وسبەینێ ئەو شتە بە درۆ ئەزانێ کە ئەمڕۆ ئیسپاتی ئەکات ، لە بەر ئەوەیە ئەبیني بەندەو شـوێن کەوتووەکانی هەمیشـە لە دڵە ڕاوکەو پشوي گیانیو ئاژاوەی دەروونی یان ودامەزراوی‌یان نیە » .

جا ئەگەر باوەڕ هیچ سوودی تری نەبوایە لە ژیانی مرۆڤایەتی یا تەنیا ئەو دامەزراوی دڵو دەروونە نەبێ کە مرۆڤ لە مەیدانی باوەڕ بە خوادا دەستي ئەکەوێو ڕوی تێ ئەکات بە دڵو بە کردەوە وبەرابەرکێی شەڕو خراپەو گومڕاهی ئەکات لە بەر خاتری ڕەزامەندی

ئەو هەوڵ ئەداو خۆی ماندو ئەکات لە ئاوەدان کردنەوەی سەرزەویدا بە هیوای پاداشی گەورەی ئەو ، ئەگەر بێجگە لەمە هیچ سوودی تری نەبوایە ، تەنها ئەمە بەس بوو بۆ دەست گرتن بە باوەڕو بۆ تویشولی وەرگرتنی .

مرۆڤ بە بێ باوەڕ چییە ؟ بە بێ باوەڕ بە ژیانێکی هەتا هەتایی ونەبڕاوە بە های مرۆڤ ئەبێ چی بێ ؟

بێگومان بە ناچاری هەست کردن بە لە ناوچون بە سەریا زاڵ ئەبێ هەست ئەکا بە کەمو کوریو بە کورتي تەمەني لە بەرابەری ئەو هەموو خەیاڵو هیوایەیەوە ، لە بەر ئەوە ئەکەوێتە پەلە قاژە بە شوێنی ئارەزووەکانیا بەڵکو لە ماوەی کورتي ژیانیا بەشێکي زۆر لە سامان پێك بێنێ ، وەچەمۆڵە دا ئەدا بە سەر زەویو سوودو کەڵکەکانیاو دەست ئەکا بە زۆران بازی لە گەڵیا بۆ ئەوەی لەو تاقە هەڵە بۆی هەڵکەوتووە دەستی بە سەر هەرچیاگەیي لە قازانجي کاتی بیخاتە ژێر دەستی خۆی .

بەم بۆنەیەشەوە مرۆڤ نزم ئەبێتەوەو بەرەخوار دێتەوە لە هەست ولە بیرکردنەوەدا ، لە لێك دانەوەی ئامانجەکاني ژیانا ولە هۆی جێبەجێ کردنیانا ، سەر بەرەو ژێردا ئەگەڕێ بۆ ژیانێکي شەڕە شەقي پڕ لە مەینەتو بێ تامي ئەوتۆ کە ڕەگي دۆستایەتيو مرۆڤایەتي

تیایا لیٚ نادات ، وخۆشەویستیو ویستنو بەزەییو یارمەتي نایەت بە دڵیا ، شۆڕ ئەبێتەوەو بو لای داخوازیەکاني ئەندامەکاني لاشەو پێویستیەکاني وبەس ، وئیتر هیچ کاتیٚ سەر هەڵ نابڕیٚ بۆ لای سۆزی ئادەمیزادیەتي ومانای بە ڕیزی مرۆڤایەتي بەرز .

جا ئەگەر بیرو باوەڕ هیچ سوودی نەبەخشیٚ لە ژیاني مرۆڤایەتيدا بێجگە لەو فراوانیەی ئەو بەخشی بە مرۆڤە خاوەن باوەڕەکان بێجگە لەو هیوایەی بە ژیاني پاشە ڕۆژی هەتا هەتاییەی تیایانا دروست ئەکا کە لەوێدا ئەگەن بە هەموو ئاواتەکانیان وهیوایان تیا ئەهێنەدی وە بە هەرچیەك بێت بە دڵیانا ـ وەزیاتر لەوەیش ـ لەزەت وەرئەگرن .
وەئەگەر ئەمەیش تەنیا کەڵکي هەر ئەوە بوایە ئەو شەڕە شەقو زۆران بازیەی نەختیٚ ســـووك و هیواش بکردایەوە و پشویەکي بدایە بە مرۆڤەکانو ڕێگای خۆشي بکردایە بۆ دامەزراندنیٚ خۆشەویستیو برایەتي وســـۆزو یارمەتيو دۆستایەتي لە نێواني مرۆڤەکانا ئەگەر کەڵکي هەر ئەمەیش بوایە بەس بۆ دەست پیٚگرتنیو خۆ پیا هەڵ واسینیو توێشو لیٚ وەرگرتنی .

دیسان لە سوودەکاني باوەڕ بۆ مرۆڤایەتي ڕزگارکردنو ئازاد کردني لە دەست هەموو دەسەڵاتیکي سەر زەوی کە دەستی ببەستیٚ ولە ئیشي بخات ، یان لە پێشکەوتن ڕایوەستێنی یا بەرهەڵستی سەر-

گەوتنی بکات .

باوەڕ ڕزگاری ئەکات لە دەستەڵاتي زۆردارو گومراهەکان ئەو ناپاکانەی ئەیانەوێ مرۆڤەکان بکەن بەخزمەتکارو بەندەی خۆیان ویان خەنە ژێر دەست بە زۆربە ترساندن ، وەخەرجو باجي ناهەقیان لە سەر دائەنێنو کەرامەتو جوامێری‌و سامانو ناموسیان لێ دائەڕنن وداگیر ئەکەن . باوەڕ مرۆڤ ڕزگار ئەکا لە زۆرو گومراهي ئەمانە بەوەی کە هەموو دەسەڵاتێك ئەگێڕێتەوە بۆ لای خوای تاك و تەنیاو پەروەردگار ، وەتێي ئەگەیەنێ کە هەر خوایە خاوەني موڵك و گێتی وەهەر ئەوەکە زۆرو دەسەڵاتي هەیە بە سەر هەموو کەسا ، وەمرۆڤەکان هەموویان ـ بەبێ جیاوازی ـ بەندەی ئەون وزیان وقازانجي هەموان تەنیا بە دەست ئەو خوایەیەو ئەوانیش هەموویان ئەبێ یەکە یەکە بچنەوە خزمەتو بەردەمي ئەو خوا گەورەیە بە بێ هیچ جۆرە ملەجەڕەو سەرپێچی‌یەك .

ئالێرەدا مرۆڤەکان ڕزگاریان ئەبێ لە ترساندنیان لە مرۆڤێکي وەکو خۆیان کە هیچ کام لە ئێش‌و کارەکانی خۆی بە دەست خۆی نەبێ چ جای هینی ئەمان ، وەئەوو ئەمان بە تێکڕایی ملیان شۆڕو کە چەبۆ ئیرادەو خواهیشی ئەو تەنیا خوا بە دەستەڵاتەیە .

وەئازادیان ئەکات لە دەسەڵاتی شەهەوات‌و ئارەزووەکان ـ هەتا ئارەزوی ژیان ـ وەئەمەیش تەنیا چەکێکە زۆردارو ستەمکاران بەکاری ئەهێنن بۆ ژێر دەست خستنی مرۆڤەکان چونکە ئەگەر هەتەری‌و سووری خەڵك نەبێ لە سەر ئارەزو و حەزیان ، چۆن بە ڕیسوایی و ژێر دەستی ڕازی ئەبن؟ یا چۆن بەرابەرکێی‌ئەو زوڵم‌و زۆرانە ناکەن کەڵێیان ئەکرێ ؟ لە بەر ئەمەیە ئیسلام زۆر سوورە لە سەر ئازاد کردنی مرۆڤ تابتوانن لە بەرابەری شەڕو خراپەوە هەڵویستی مرۆڤانەی بە هێزیان هەبێ نەك بە ژێر دەستەیی‌و ڕسوایی‌و مل شۆڕی‌و داماوی ڕازی بن . وەڕزگار بون لە دەسەڵاتەکانی ئارەزو وەنەبێ بە تەنیا بۆ بەرەبەرەکانی زاڵم‌و گومڕاکان بێ‌و بەس بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا ئامانجی تایبەتی هەموو مرۆڤێکە بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات لە پێ‌گیران و بەندەیەتی ئەو ئەندامانەی لاشەیەکە ئەو ئارەزوو داخوازی‌یانەی هەیە وەلەوەی بکەوێتە ژێر دەسەڵات‌و زۆریانەوە .

ئەو کەسەی ئەچێت بە دەم ئارەزووکانی‌یەوە تا تیایانا نوقم ئەبێ لە سەرەتاوە وا ئەزانێ زیاتر لە خەڵکی ڕاتەبوێری‌و لەزەت لە ژیان وەرئەگرێ ، وەئەم باوەڕە « ناڕاستەی » باش ماوەیەکی کەم ڕای ئەکێشێ بۆ کۆیلەیی‌و بەندەیی‌یەکی ئەوتۆ کە ڕزگاری نەبێ لە دەستی

وه ئەي خاتە نارەحەتيو گير خواردنێكي واوه كە حەوانەوەو ئاسايشيان لێ ياساخ ئەكات ، خۆ ئارەزوو شەهەوات بە زيادە، رەوي تيايا تێز نابێ وله سنووريكا ناوەستێ بەڵكو هەتا لەگەڵيا برۆي ئەو بلێسە ئەسێنێ وزياتر پەلامار ئەداو وخاوەنەكەي ئەگرێو له هەموو ئيشێكی ئەخاو هەموو ئامانجي بريتی ئەبێ له هەوڵدان لە رێی تێر كردنيا .

بێگومـان بەم پێيە ژيان پێش ناكەوێ وەمرۆڤايەتی هەتا لەم زۆرداره نهێنيیە رزگاري نەبێ سەر هيچي ناپەرژێو سەرناكەوێ وله كاروباريدا گەشە ناكات . بۆيە ئيسلام ـ كە ئايينێكی ئازادكەرو كۆمەلايەتیيە ـ زۆر بەمە بەستێكی گرنگي دائەنێ رزگار كردني مرۆڤ لە دەست چەپۆكي ئارەزوو ، بەلام نەك بە شێوەيەكي پەست كردن يا بە پێويستي بكێڕێ ژياني تەنيايیيا ژيان لە گۆشەكانی مزگەوتو تەكيەو خانەقاكانا يا بێ بەشي بكا لە ژيانو رابواردنو خۆشي « قل من حرم زينة الله التي أخرج لعباده والطيبات من الرزق ١ » ياني ئەێ پێغەمەر پێيان بڵێ : كێ ئەو شتە جوانو شيرينانەي ياساخو قەدەغە كردووه كە خوا بۆ بەندەكاني خۆي دروستی كردووەو دەري هێناوه لەگەڵ رزق و رۆزي پاكو خاوێنا .

---

١) الاعراف ٣٢

بەڵکو لە نێواني چوار چێوەیەکي شیرینا بەڕازانەوەي چون بە دەمي ئارەزوویەوەو بە تەرخان کردني کاتي تایبەتي بۆ ڕابواردنو لەزەت وەرگرتن ، وەدواي ئەوە هەموو توانایەکی پێ ئەخاتە ئیشەوە بۆ بەرز کردنەوەي ووتەو مەبەستي خوا لە ئاوەدان کردنەوەي سەر زەويدا ، بەم پێیە ئیسلام مەبەستی تایبەتي بۆ هەموو کەس داناوە کە شتێکي گونجاوە لە حەوانەوەو ڕابواردن ، وەئامانجێکي کۆمەڵایەتیشی دیاري کردەووە کە بە پێي ئەوە تواناو لێ هاتویي هەموو کەسێ ئەخاتە ئیشەوە بۆ خێرو خۆشيو بەرز کردنەوەو پێش خستني کومەڵ بە پێي نەزەریە « النظریة » گەورەکەي کە : یەك خستنيو ڕێك خستنە لە نیۆاني کۆمەڵو ئەندامەکانا لە یاسایەکا . ئەگەر بە ووردي سەیري مێژو بکەین ئەبینین : هەر نەتەوەو کۆمەڵێك ئەندامەکاني خۆیان بە ڕابواردنو چون بە دەم ئارەزووەوە خەرۆ کردبێو تیایا ڕۆچوبن لە پاشا یەك ئەنجامیان دەست گیر بووە : فەوتانو لە ناو چونو پورتکانن !! چيبوو ڕۆماني کۆني لە ناو برد ؟ بۆچي یۆنانيیەکان لە ناو چون ؟ هۆي ڕوخاندنی دەسەلاتي کۆني فارس چيبوو ؟ چيبوو دەوڵەتي عەباسيیەکاني ڕوخاند ؟ ئایا ئەزاني فەرەنسە لە جەنگي جیهانيی دووەما چيکرد ؟ ئایا بە یەکەم زرمە ملی شۆڕ نەکردو خۆي نەدا بە دەست دوژمنەوە ؟ هۆي ئەمەیش هەر ئەوەبوو هەمیشە

خۆي خەريك ئەكرد بەڕابواردنو هەر ئەگەڕا بەشوێن پێك هێناني
نارەزووەكانيان ، ئيتر پێي نەكرا خۆي ئامادە بكات بۆ بەرگري
كردنو ترسا لەوەي قومبولە كۆشكو ڕازاوەكاني پاريسو تياترۆخانەو
وبارەكان « مەيخانە » وجێگاي ڕابواردنەكانيان بروخێنێ ، زياتر
لەوەي كە بترسێ لەقەوارەو كەرامەتو جواميێري ميژويي . وەبێجگە
لەمانە هەزاراني تريش وەكو مێژو بۆماني دەر ئەخات .

ديسان باوەڕ مرۆڤ ڕزگار ئەكات لە پڕو پووچ [ الخرافات ]
لەوپڕو پووچ و درۆو دەلەسانەي كە جوولەكەو گاورو بت پەرستەكان
هێنايان ، لەو پڕو پووچانەي بەفڕو فێڵ سەپێنران بەسەر ئيسلاماو
ناخزانە كون و قوژبني كتێبە ئيسلامي‌يەكان بۆ تێك دانو ناشيرين
كردني ڕومەتي ڕوناكەكاني ئيسلام . وەلەو پڕو پووچانەي بە دەم
پياوە گەورەو زاناكاني ئاينەوە هەڵ بەستراون ، وەلەو پڕو پووچانەي
دوژمناني ئيسلام ياني نەگەيشتوان لە ئيسلام هەڵيان بەستووە كە
گوايا ئيسلام دژی زانينو زانياري‌يە يا لە گەڵ شارستانيەتي‌دا ڕێك
ناكەوێو ناگونجێ ، يا ئيسلام شتێكەو سياسەت شتێكي ترە . باوەر
بە تەواوي مرۆڤ لە مانەو لەوێنەيان ڕزگار ئەكا وەهەموو ئيشو
كارەكان ئەگێڕێتەوە بۆ لاي خواي پەروەردگار وەباوەڕ كردن بەخوا
وخەريك بون بۆ شارستانيەتيو ڕۆ چوون لە دەرياي زانياري‌داو تێكەڵ

بوون بە سیاسەتەوەو ... هتد .

ئەمانە هەموو ئەخاتە یەك ڕیزەوەو دەستیان ئەکاتە ملی یەك بە ڕەنگێ کە بەلاتەوە وابێ ئەمانە هیچیان بەبێ ئەوانی تریان ناگونجێن وپێك نایەن بە شێوەیەکی‌وا کە کەڵك‌و سوودیان هەبێ چونکە ئەی خاتە پێش چاو لە ڕووني کە بەبێ بووني خوایەکي زاناو بە دەستەڵات وپەروەردگار ڕژێم « نظام » وپرو گرامي گیتي « الکون » پێك نایە وناگونجێ وئەو خوا گەورە مرۆڤي کردووە بە جێ‌نشیني خۆي لەسەر زەوی‌داو کلیلی گیتي داوەتە دەســـتو پێ‌ي فەرمووە : هەرچي لە ئاسمانەکان‌و زەوي‌دایە بۆ توم دروست کردووەو تۆم بۆ ئاوەدان کردنەوەي هێناوە ، وەزانیاري‌و زانین لە سەر پێویست گیراوە ، وە پەیتا پەیتا بە پێغەمبەرەکانـا پرۆ گرام‌و بەرنامەي بۆ ناردووە تاله سەریان بڕواو بە ئاگاداري‌یەوە ئیش‌و کارەکاني ڕێك بخاوو پێکیان بێنێ وگیتي ئاوەدان بکاتەوە .

❀❀❀❀❀❀

# چەند تێبینیەك

## تێبینی یەکەم :

لە پێشەوە وتمان : شەفاعەت خوازی و تکا کردن یەکێکە لەو کردەوانەی خوا داواکارەکانی بەکافرو بت پەرست دائەنی و ئەچێ بە گژ کافرەکانا ، لەم باوەڕەیانـــداو لەوەدا کە ئەڵێن : بۆیە ئەو بتانە ئەپەرستین چونکە لە خواوە نزیکمان ئەکەنەوە .

لەمەوە هیچ کەس باوەڕی وانەبێ کە ئێمە ئەچین بەگژ شەفاعەتی پێغەمەران و پیاوچاکاناو بەڕاستی نازانین . نەخێر وانیە ، بەڵکو بەپێ باوەڕی ئێمە دوو جۆر شەفاعەت هەیە :

یەکەم : شەفاعەتێکە بەهێزو دەسەڵاتەوە بکرێ و شەفاعەت خوازەکە بیەوێ داخوازییەکەی خۆی بەجێ بێنێ و بەگوێ نەکردنی نـــەبێ . ئەمجۆرە کوفرو ناڕاستەو ئەمە بوو بت پەرستەکان هیواو چاوەڕوانیان ئەکرد لە بتەکانیانەوە ، وەلەبەر ئەوەیش بوو هەر بتەکانیان ئەپەرست وەگوێیان نەئەدا بەخواو بەفەرمانەکانی و بەهیوایش بوون سەریان بخەن و

ڕزگاریان بکەن . شەفاعەت بەم مـانایە بوو ئیمە چووین بەگۆیا و بـە کوفرمان دانا .

دووەم : بریتی‌یە لە پاڕانەوە و نزاو تکا کردن لە خوای گەورە بۆ ئیشێکی گونجاوو دروست وەکو لێبوردن و لێخوش بوون لەگوناهبارو لە خراپکاری یا بەخشینی پایە یا سامان و . . . . هتد . ئەمەیش بەبێ ئەوەی بونی هێز یـا دەســـەلاتی لێ بێ بەڵکو بەپێچەوانـە وەلەگەڵ دەست‌پان‌کردنەوە و گەردن‌کەچی‌دا ، هەر وەکـو پێش‌کەش‌کردنی پێشنیاریك بەکاربەدەستی دەولەت یا ناردنی یەکێکی‌دۆست بۆلێبوردن یا بۆ بەجێ‌هێنانی کارێکی ڕەواو گونجاو .

شەفاعەت بەم مانایە بەلامانەوە ڕاست‌و ڕەواو حەقە ، وەوائەزانین کە پێغەمبەرەکان و فریشتەکان و پیاو چاکەکان ئەم جۆرە شەفاعەتەیـان بۆهەیە ، وەبە هیواین لە پـاشە ڕۆژا کەڵکـی لێوەرگرین ولێیەوە بەهرەمەند ببین ، چونکە ئەو ئایەتانەی کە نەفی شەفاعەت بۆکافرەکان ئەکەن بەئاشکرا لێیانەوە وەرئەگیرێ کەشەفاعەت بۆ موسڵمانان هەیەو سوودی لێوەرئەگرن ، وەدیسان ئەو ئـایەتە پیرۆزەی قورئان کـە ئەفەرموێ :

« وأستغفر لذنبك وللمؤمنين والمؤمنات » ١ : یانی ئەی پیغەمبەر

---

١) لەسورەی محمد ١٩

داوای لی بوردنی گوناه بکه بۆخۆت و بۆ موسلمانان پیاویان و ژنیان.

ئەمە کوت و مت مانای شەفاعەتە بەبێ پێچ و پەنا ، وەپێغەمەر ئەی فەرموو :

( نزاو پارانەوەی موسلمانان بۆیەکتری لەپاش‌ملەدا گیرا ئەبێ).
وەبێجگەلەمانەیش زۆرو زەبەنە فەرمووده هەیە لە باسي شەفاعەتا بە رادەیەك کە بەگژا چوونیان و لادانیان لە مانای راسـتی دووره لە حەقیقەت و راستی‌یەوە و کەمتەرخەمی‌یە بەرابەری ئایین.

ئێمە بەمە باوەڕمان هەیەو بەم باوەڕو هیوایەوە ئەچینە خزمەتی خوای گەورە و بە هیواین لەشەفاعەت و تکای پیشەوای گەورە و دڵسوزمان پێغەمەری ئیسلام « دروودی لەسەربی » بەهرە وەرگرین و بێبەش نەبین ، وەهەرکەسێ ویژدانی بێ و بەچاوپێچکی فەلسەفەی ولاتە بێگانەکان چاوی خۆی نەبەستێتەوە وەکو ئێمە ئەبێ وە وەکو ئێمە ئەڵێ . بەلام لێرەدا شتێك هەیە پێویستی بەباس‌کردن هەیە ئەوەیش ئەمەیە : ئێمە لە پێشەوە ووتمان ـ شەفاعەت بریتی‌یە لە پارانەوە و دەست پان‌کردنەوە بەمەلکەچی‌یەوە ئیتر خوای گەورە بەزەیی بێتەوەو گیرای بکاو وەری بگرێ یان نا ، هیچ‌کەس دەسەلاتی تیایانیە ، وەنابێ بەمالی دابێی و بەهیوای ئەوەوە کەمتەرخەمی‌بکەیت.

کەواتە نابێ موسلمانان لەم جیهانەدا سستی و تەمەلی بەکاربینن و

گوێ نەدەنە خوا پەرستي و پەیڕەوی فەرمانەکانی ئیسلام نەکەن و هەڵنەسن بەپێویستی‌یەکانی سەرشانیان بەرابەر بە ئیسلام و بەهیوای‌ئەوە بن کە سبەینێ بەشەفاعەت ئەپەڕنەوە و ڕزگاریان ئەبێ ، بەڵکو پێویستە بەپێی‌توانا هەول و تێکوشان و خەباتیان هەبی و هەمیشە توبە و پەشیمانی بەکاربینن وەبو کەم وکوری و خوارو خیچی و نەفامي دلیان بە شەفاعەت خوش‌بی لەگەل ترس و لەرزا .

## تێبینی دووەم :

### چونە سەرگۆڕستان

باسەکە سەر ئەکێشێ بۆ ئەوەی هەندێ باسی چونە سەرگۆڕستان ( زیارة المقبرة ) بکەین : پێغەمەری خوا ( درودی لە سەربێ ) فەرموی بە یارەکانی : « ئەوسا یاساخم کردبو لێتان چونە سەرگۆڕستان بەلام ئێستا پێتان ئەلێم : کە بچنە سەري‌و زیارەتی بکەن » چوونە سەرگوڕستان بۆ هەرکەسێ بە هۆش‌و گۆشەوە بڕوات سوودی زۆري لێ وەر ئەگیرێ :

مرۆڤ ئەگەر چووە ناو گوڕستانەوەو بیری کردەوە کە ئەوانەی ئێستا لە ژێر ئەو خۆڵو خاکو بەردەدان ، ئەوانەی لەو چاڵە قووڵ

وتەنگ‌و تارەدا ڕاکیشراون وهیچ جۆرە جم‌و جوولێکیان نیە ، ئەوانەی بوونەتە ڕارەوو کـەوتوونە ژێر پێی ئەم‌و ئەوو هەموو گیانەوەرێك بە سەر ووگیاندا تێ ئەپەڕێ و ئەگەڕێ ، ئەوانەی لاشەکـەیان بوەتە خۆراکی مشك‌و مارو مێروو کرم تێی داون ، ئەوانەي تواناي هیچیان نیەو دەنگ‌و ڕەنگیان نەماوە ، ئەوانەی لاشەیان ڕزیوەتەوە بەخاك‌و خۆڵ ، ئەوانە هەموویان چەند ڕۆژو کاتی لەمەوپیش وەکو ئەو زیندو بون و بەو جیهانە گەورەو فراوانەدا گەڕاون وسووڕاونەتەوە ، ئەوانە نەماڵ‌و سامان و نەعیلم‌و زانیاری‌و نەپیشە و هونەرو نەخزم‌و کەس و کار نەتیرەو نەتەوەو نەسوپاو لەشکرو نەعەقڵ‌و فام و ژیری‌و نەشان و پلەو پایەو نەجوانی‌و پێ‌کەوتن‌و نەهیچ شتێکی‌تر نەي توانیوە لە مردن ڕزگاریان بکات ، ئەوەتا مردون‌و وایان بەسەر هاتووەو جیهانیان بەجێ هێشتووە و ئەو شتانە فریایان نەکەوتون ولە لایان نەماونەتەوە تەنیـا کردەوەي تـایبەتی خۆیـان نەبێ ، ئەگەر هەرکامیان کردەوەي باش بووبێ ئێستا گۆڕەکەي بۆ بووەتە باخچۆلەیەکی بەهەشت ـ خۆزگەي پێ بێت ـ وەهەرکامیان کـردەوەي خراپ بووبێ گۆڕەکەي بوەتە شیوێکی دۆزەخ ( خوا پەنامان بدات ) .

ئالێرەدا بیر ئەکاتەوە کەوا ئەمیش هیچي لەمانە زیاتر نیەو نابێ وەئەمیش پاش ماوەیەکي‌تر ئەچێتە لاي ئەوان‌و پاشە ڕۆژو چارەنوسی

ئەمیش وەکو ئەوان وانەبیٚ ، وەئەمیش تووشی ئەو چاڵە تاریکە سامناکە ئەبیٚ وهاو ملی کردەوەي خوٚي ئەبیٚ بە چاکە یا بە خراپە . ئینجا دڵی لەرزەي پیٚ ئەکەویٚو مەترسي لیٚ ئەنیشیٚو ئەکەویٚتە کردنەوە وەلیٚ کوٚڵینەوە لە کردەوەکاني خوٚيو هەوڵ ئەدا بوٚ چاك کردن و ڕیٚك خستني ئیشو کاري بەو شیٚوەیەي خواو پیٚغەمبەر لیٚي ڕازي بن وەپیتا پەیتا توٚبە ئەکاو پەشیمان ئەبیٚتەوە لە کردەوەي ڕابوردوي ولەو نەفامي‌یانەي بەسەریا تیٚپەڕیوە ، وەئەکەویٚتە موحاسەبەو پرسیار کردن لە نەفسو دەروونی خوٚي . بەم جوٚرە مروٚڤي خاوەن هوٚش بەچوونە سەرگوٚڕستان ئەتوانیٚ ڕیٚي ڕاستو ڕابەری ڕاستەقینە دەست خوٚي بخات بوٚیە پیٚغەمبەر فەرموي : « زیارەتي گوٚڕستان بکەن » وەشیٚخەکاني ڕیٚگای خوا داوا ئەکەن لە سوٚفيو دەرویٚشەکانیان کە بچنە سەر گوٚڕستان ، وەهەروەها کوٚمەڵە ئیسلامي‌یە ڕاستەکانیش ئەمەیان بە پیٚویستیٚك داناوە وکردویانە بە بەندیٚك لە ئیشو کارا .

## ڕیٚ و شویٚنی چونە گوٚڕستان

کە چوینە گوٚڕستان باش وایە دەستنویٚژمان بیٚ و لاشەو بەرگ و دڵ و دەرونمان پاك و خاویٚن بکەین و بەهیوای ئەوە بچین کەدڵمان نەرم بیٚ و پەندی لیٚوە وەرگرین ، وەلە ڕیٚوە بڵیٚین : سەلامی خواتان

لەسەربێ ئەی گرۆی موسڵمانان ئێوە پێشەنگی ئێمەن و ئێمەیش دێین بە دواتاندا ، خوا لە ئێمەیش و ئێوەیش خۆش بێ و لێمان ببورێ .
ئەنجا دەست بکەین بەخوێندنی «فاتحة»و هەر چەندێکی‌تر بۆمان ڕێك‌کەوت لە قورئـان و سـلاوات و ذکر ، وەلە دوایی‌دا لەخوا بپاڕێینەوەکە لێمان وەرگرێ و بی‌بەخشێن بە مردووەکان ، ئەنجا دەست بکەین بەنزاو پاڕانەوە بۆ ئەو مردووانە و بۆخۆمان و بۆ هەرکەسی‌تر ویستمان ، لە پاشا دەست بکەین بە بیرکردنـەوە لە ڕابوردوو ئێستە و ئەمەو دواي مردووەکان و لەگەڵ خۆمانا بەراوردی بکەین ، وەکو لە پێشەوە ووتمان ، وەکە بێ‌تاقەت بووین بکەڕێینەوە بە فاتحە و پاڕانە- وەوە ، وەئەبێ شێوەی شەرم و حەیامان هەبێ و بزانین کە ئەوانـە زیندون و لەگەڵیان ئەلێین و دائەنیشین و ئەدوێین .
بەڵام دەخیل سەد دەخیل - ئەی موسڵمانی بەریز - نەکەی دەست بکەی بەماچ کردني دارو بەرد و خاك و خۆڵ ، یا نەکەي «جۆلانە» بگریتەوەو بەرد بلکێنی بەکێلی گوڕەوەو لەنیازو نێتی دڵی‌خۆت یا نەکەی شێخەکە بکەی بەکولوی نان و ئابڕوی بەری ، نابێ بلێیت «یا شێخ ! یا فـلان کوڕم پێ ببەخشە یا دەردەکەم چارە بکە یـا بم پارێزە یا ئاگات لێم بی . . . هتد»

ئەمانە هەموویان شێوەی بت پەرستین و دوورن لە موسڵمانەوەو موسڵمان ئەبێ هەرخواپەرستێ و بەس وەهەر داوا لەو بکا و بەس ، ئەبێ بڵێت : خوایە پەنام هێناوە بۆ لای ئەم شەخسە کە بە خۆشەویستی تۆی ئەزانم ، خوایە بۆ خاتری ئەم شاخسە ئەو مەبەستەم بۆ بەجێ بێنەو فلانو فیسارم بدەرێ و لەو شتانەبم پارێزە ، ئیتر لەم شێوەیە زیاتر ڕێگەت نیەو ئەچیتە ناو مەترسیەوەو ئەو شەخسەیشت لێ تورە ئەبێ ئەمە کاکڵەو ناو کرۆکی ئادابی زیارەتە .

## تێبینی سێ۳یەم :

لە پێشەوە باسمان کرد کە هەرکەسێ بێجگەلە خوا هاوار لە هەرکەسێ بکا یاوا بزانێ گوێی لە دەنگیەتی و ئەتوانێ بێت بەهاواریەوە ئەو کەسە هاوەڵی بۆ خوا داناوەو بەو باوەڕەو کردەوەیە لە ئیسلامەتی دەر ئەچێت . ئەمە مانای وانیە کە ئێمە ئەچین بەگژ تەریقەت « طريقة » دا ـ هەرکامیان بێ ـ نەء وانیە بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم باسەی ئێمە سەر ئەکێشێ بۆ گیانی خاوێنی تەریقە ولە گەڵیا دەستیان لە ملیەکایە .

تەریقە « واتە ڕێگای گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا » ـ هەر

کامیان بێ لە ژێر هەررژێمو ناو نیشانێکابێ - ئێمە بەشتێکی ڕاست وکاکڵەی ئاینی دائەنێین ، چونکە تەریقەت خۆی بریتی‌یە لە : پاك و خاوێن کردنەوەی نەفسو دەروون لە ڕەشایەتی گوناهو خراپکاری‌وە پەروەرش کردنو ڕازاندنەوەیەتی بەڕەوشتو سیفەتە بەرزو پڕسوودەکان وبەگوێ ڕایەڵی خواو تەقواو پاراستنو بە ئارەزوی [ بە خواو بەرەزامەندی خوا ] گەیشتن .

تەریقەت بەم شێوەیە لە قورئانو فەرموودەدا بە زۆر ووشە هاتووە وەکو پاڵفتە کردن «تزکیە» ( هو الذی بعث في الامیین رسولاً منهم یتلو علیهم آیاته ویزکیهم ویعلمهم الکتاب والحکمة وان کانوا من قبل لفي ضلال مبین ١ ) واتە خوا ئەوەیە کە لە ناو نەخوێندەوارەکانا - لە ناو عەرەبەکاندا - پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ناردون فەرموودەی خوایان بۆ ئەخوێنێتەوەو پاڵفتەیان ئەکاو قورئانو حیکمەتیان فێرئەکاو تێیان ئەگەیەنێ ئەگەرچی لەوەو پێش لەگومڕایی‌و سەر لێشێواویا بوون « ونفس وما سواها فألهمها فجورها وتقواها قد افلح من زکاها ٢ » واتە قەسەم بە دەروونو بەوەی ڕێكو پێکی کردووەو چاکەو خراپەی تێ گەیاندووە ڕزگارو سەر فراز ئەو کەسەیە دەروونی خۆی پاڵفتەو خاوێن کردووەو ڕازاندویەتەوە .

---

١) الجمعة ٢ ٢) الشمس ٧ - ٨ - ٩

وه وەکو چاکە کردن « الاحسان » بە دڵسوزی‌یەوە : لە پێغەمەری خوایان پرسی : چاکە کردن کامەیە ؟ فەرمووی : بە جۆرێ خوا پەرستی وەکو چاوت لێوەی بێ ، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەو تۆ ئەبینێ یا وەکو « توکل‌و ذکرو فکرو زهدو وێنەیان » کە بە زۆری لە ئاینا باس کراون وە ئەبینین ئاینی ئیسلام لە ڕووی پەرستنەوە ئەبێ بە دوو بەشەوە :

یەکەمیان : ئەو ووتارو کردارو پەرستنانەی کە ئەکرێن بەنیشانەی ئیسلامەتی وەلە کتێبە فیقهەکانا باس کراون بە درێژی .

دووەمیان : بریتی‌یە لەو کردەوانەی زیاتر پەیوەندی‌یان بە دەروون و دڵەوە هەیەو بە زۆری نهێنی‌و پەنامەکین .

وەئەم دوو بەشـــە لە یەك جیا نابنەوەو بەهەر دووکیانەوە ئیسلامەتی پێك دێنن یەکەم وەکو لەش‌و دووەمیان وەکو گیان « روح » وایە ، یا یەکەم ئەندامی دیاری‌و دووەم ئەندامە پەنامەکی‌یەکانی لەشن وە بە هیچ شێوەیەك لێك جیا ناکرێنەوە وەئەمانە هەموویان کاڵای باڵای پێغەمەرو یارەکانی بوون .

## مێژوی تەریقە :

لە کۆتایی سەدەی یەکەم و سەرەتای سەدەی دووەما وولاتی

ئیسلام گەورەبوو سامان پەرەی سەندو موسڵمانەکان بوون بە خاوەنی بەشی زۆری جیهان بە ڕەنگێ سەرۆکی موسڵمانان ئەی ووت بەهەور لە ئاسمانا : « ڕو بە خۆر هەڵات یا خۆر ئاوا ئەڕۆی بۆ هەرکوێیەك بچی بەری بارانەکەت یەت بۆلام » .

بێگومان ئەبێ خەڵکی ڕو بکەنە جیهان و ڕۆ بچن لە نازو نیعمەت‌و ڕابواردناو هەندێ جار لە سنوورا بوەستن‌و جارجاریش لە سنوور تێپەڕن ، ئەمەیش بەگوێرەی کاتی پیغەمەر « درووودی لە سەربێ » گۆڕان‌و پێچەوانە بوو لە هەندێ ڕویا ، ئالەم کاتەدا هەندێ لە زانا بەرزو لە خوا ترس و دڵسۆزەکان کەوتنە ئامۆژگاري کردنی موسڵمانان و بیر خستنەوەیان بە وانەی لە بیریان چوو بوەوە دەستیان کرد بە پەروەرش کردنیان لەم ڕووەوە یەکەم زانایە هەڵسا بەم خزمەتە گەورەیە « شیخ حسن » بەسری بوو ( خوا لێي خۆش بێ ) وە دوای ئەو زۆر لە پیاوە باشەکان دەستیان کرد بەم بانگە بە ڕێزە ، وەلێرەدا ئەڵقە نشین‌و تەریقەت بەم شێوەیە بەرپا بوو شان بە شانی پەیا بوونی عیلمی ئوصولی فیقهو کەلام و ... هتد ، وە ئەویش ووردە ووردە پەرەی سەندو بوو بە عیلمێکی سەر بە خۆو ناونرا بە عیلمی ( تصوف ) بەلام ئەم عیلمە لەم سنوورەدا نەوەستا بەڵکو لە وەتێ پەڕیو بوو بە

دایەرەیەکی جیاواز و فەلسەفەو مەنتیق‌و وەرزش و ڕیازەي ئومەتە پیشووەکانی تێکەڵ کرا لە سەدە دوایی‌یەکانا ، وەجۆرها جەزبەو حاڵەت وهەراو بەزمي تیا پەیدا کرا ، وە ئەتوانین بڵێین : لە زۆر کاتا سیاسەت دەستی تێ‌کیشاو پارچە پارچەو بڕبڕکرا لێرەدا دەرگای کرایەوە وزۆر پیاوي بێ‌ئایین و خراپ بە تەمای سەر شێوان و خراپکاری خۆی تێ‌کێشا بە دەنگي کە هەموو کردەوەو نوسراو کە لەم ڕووەوە دەر ئەچوو جێگاي تێ‌بیني بوو لە لایەن دڵسوزەکانەوە .

شتێکي ئـاشکرایە کە تەریقە ( تصوف ) لە گەورەترین هۆی بلاو کردنەوەی ئاییني ئیسلام بو لەو وولاتە دوورانەی هاتنە ناو ئیسلامەتی‌یەوە ، تەریقەت خزمەتی گەورەی هەیە بو دڵ‌و دەروون پاك کردنەوەي موسڵمان . بەلام ئایا بۆ پێك هاتني ئەم بەشی دووەمی ئیسلامەکە تصوفە پێویست‌ئەکا بەشێخیکی زیندو کەلەسەر دەستي ئەواو بە پێی ڕاوێژو ئامۆژگاری ئەو نەبێ موسڵمانەکان نەتوانن ئەم ڕێگاو پلەیەیان ببڕن ؟ یا ئەتوانن یەکسەر پێغەمەر بکەن بە مامۆستاو ئامۆژگاری لە قورئان و فەرموودەوە وەربگرن . خیلاف‌و جیاوازي هەیە لە نیوانی زاناکانا و هەر کومەڵە وان لە سەر لایەکی ، وئیمامي غەزالی خوا لێی خوش بێ دووەمیان بە ڕاست‌تر ئەزانی[٧] . وەبەلاي نوسەري

هەژاریشەوە دوومیان دوورترە لە زیان وسەر لیٚ تیٚك چوون .

ئەنجام : لەمەی پیٚشەوە دەرکەوت تەریقەت « واتە ڕیٚگای گەیەنەر بە خوا » یانی ئەو ڕیٚگایە کە بتوانیٚ تیا ئیش و کارو پیٚویستی‌یە ئایینی‌یەکانت بە ئاشکرایی و نەهیٚنی‌یەکانی‌یەوە بەگویٚرەی داخوازی‌یەکانی فەرموودەکانی خوای گەورە و پیٚغەمەری خوٚشەویستەوە بەجیٚ بیٚنیٚ وەشیٚخ بریتی‌یە لەوماموٚستا و ئاموٚژگاری‌کەرە زاناو دڵسوزەکە ئاگای لەئیش و کارەکانت بیٚ و سەرپەرشتی جولاٚنەوەکانت بکاو هەموویـان بنەترازوی ڕاستەقینەی ئیسلام بکیٚشیٚ و نەیەڵیٚ ڕیٚ‌گوم‌بکەی وەسەرت لیٚ‌بشیٚویٚو بکەوی و ملت بشکیٚ.

وەئیتر زیاتر لە مانە توٚ ـ ئەی موسڵمانی بەڕیز ـ شیٚخ بکەی بە غەیب زان و داوای‌کەشف و کەراماتی لیٚ‌بکەیت و ئاگای لەدەست و دەم و دڵت بیٚ ، یا بتوانیٚ کوڕو کچ و ماڵ و سامانت بداتیٚ ، یـا دەردت چارەبکا و دەســـت لە دڵت بداو دیـٚو درنجت لیٚ‌دوور بخاتەوەو لە دوورو نزیك لەلات ئامادەبیٚ و فلاٚنت بوٚ بـــکوژیٚ و فیسارت بوٚ لەناوبەریٚ و . . . هتد .

ئەمانە هەموویان پیٚچەوانەی تەریقەو پیٚچەوانەی ئیسلامەتی و پیٚچەوانەی ڕاستین ، وەهاوەڵ و شەریك بوٚ خوا دانانن ، وەبەمە !

تۆ یا لەئیسلامەتی دەرئەچی یا گوناهو بێشەرمیەکی گەورەت کردووە وەئەو شێخەت کردووە بەهاوەڵی خوا یا کردوتە بەکولوی نان و ئابروت بردووە ، وەمرۆڤی ژیر ـ چ جای موسڵمان ـ شتی وا ناکات ، سەیری خاوەنی شەریعەت بکە «دروودی لەسەربێ» ئەی فەرمو :

« دڵی موسڵمان لەنێوانی دوو پەنجەی دەستەڵاتی خوادایە بە هەرلایەکا بیەوێ ئەی سوورێنێ » . نەك بەدەست پێغەمەران یا شێخ و زاناکان بێ .

❁❁❁❁❁❁

# پایەی دووهەم لە ئیسلاما

## نـــویـژە

ئاینی ئیسلام نوێژی بە شتێکی گەورە و گرنگ داناوە ، قورئانی پیرۆز زیاتر لە (٨٢) ئایەتا باسی نوێژی کردووە : داوای بەجێ هێنانی ئەکا و فەرمانی پێ ئەداو بەشان و باڵیایەت و ئەی‌کات بە چاودێر بەسەر مرۆڤەوە و لە گوناهو خراپەکاری ئەی‌گێڕێتەوە :

( إن الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر ) ١ : یانی نوێژ موسڵمان ئەگێڕێتەوە لە خراپەو گوناهو ناڕەوایی ، وەئەی‌کات بە پەناو بەجێگەی دڵنیایی بۆداماوو تین پێگەیشتووان .

( واستعينوا بالصبر والصلاة ) ٢ : یـانی یارمەتی و پشتیوان بۆ خۆتان پێك بێنن بەهۆی ئارام گرتن و نوێژ کردنەوە ، وەداماوی و هاوارو خراپە ئەکات بە دروشم « شعار » ی نوێژنەکەران و ئەوانـەی

---

١) العنكبوت ٤٥ . ٢) البقرة ٤٥ .

کەمتەر خەمي تیا ئەکەن « فويل للمصلين الذين هم عن صلاتهم ساهون ١ » یانی سزای سەخت و هاوارو پەرێشانی بۆ ئەو نوێژ کەرانەی لە نوێژەکانیانا کەمتەر خەمی ئەکەن ، چ جای ئەوانەی نوێژ ناکەن . وەپیشانی ئەدا کە کافرەکان لە دۆزەخا لە کاتی سکاڵاکردنا نوێژ نەکردن ئەکەن بە هۆی چونە ناو دوزەخیانەوە « قالوا لم نك من المصلين ٢ » یاني ئەڵێن : ئێمە نوێژکەر نەبوین و نوێژمان نەئەکرد وەهەر قورئان لە چەند شوێنێکا نوێژ کردن ئەکا بە یەکێ لە هۆیەکانی سەر بەرزیو ڕزگاربون « الم ذلك الكتاب لا ريب فيه ... ويقيمون الصلاة ... واولئك هم المفلحون ٣ » ئەوەتە ڕزگاری هەڵ سەندووە لە سەر چەند شتێ کە یەکێکیان نوێژ کردنە ، « قد أفلح المؤمنون الذين هم في صلاتهم خاشعون ٤ » واتە سەرفرازو سەرکەتوو ڕزگارن ئەو موسڵمانانەی لە نوێژەکانیانا دڵ ئاگادارو بە شەرم و مل کەچن ، وەزۆرو زیاتر لەمانەیش قورئان لە باسی نوێژا ئەڕوات .

وەپێغەمەر ( دروودی لە سەری ) زۆر بەگرنگی لە نوێژ ئەدوێ ، ئەفەمووێ : « نوێژ کوڵەکەی ئایینە ، هەرکەسێ بە باشي بیکات ئاییني بە ڕاستي ڕاگرتووە ، وەهەر کەسێ بە جێی نەهێنێ ئاییني خوێ ڕوخاندووە » وەلە پێشەوە زانیمان کە نوێژی کردووە بەیەکێ

---

١) الماعون٤ـ٥ ٢) المدثر٤٣ ٣) البقرة١ـ٥ ٤) المؤمنون١ـ٢

له پاش و پایەکاني ئیسلام ، وەبەزۆر شێوەی تر باسي لێ فەرمووە و سوودی نوێژ کردن و زیاني نوێژ نەکردني دەرخستووە .

وەزۆر لە یارە خۆشەویستەکاني پێغەمبەر وەلەزاناکاني ئیسلام لایان وایە کە نوێژ نەکردن بەبێ بیانوویەکی شەرعی مرۆڤي پێ کافر ئەبێ.

ئایا بۆچی نوێژ لە ئیسلاما ئەم پایە بەرزەی دراپێتي ؟ لە وەلاما ئەلێم : نوێژ پەیوەندییەکي پتەوە لە ناوەندی خوای پەروەدگار وبەندەکانیا ، لە هەموو شەو ورۆژێکا پێنج جار ئەم پەیوەندی بەندایەتی‌یە تازە ئەبێتەوە ونوێژکەر دەری ئەبڕێ کە بەندەو مل کەچ‌و موحتاجی پەروەردگارەکەیەتی‌و سەری بەندەیی بۆ شۆڕ ئەکاو گەردن‌و ملی بۆ کەچ ئەکاو دەستی زەلیلی بۆ پان ئەکاتەوەو دەم‌و چاوو ڕوی شیریني خۆی بۆ ئەخاتە سەر زەوی ولە بەرابەری گەورەیی‌یەکەیەوە بەهەموو شێوەیەکی بچوکی‌و شەرمەوە ڕا ئەوەستێ‌و ووتووویژی لە گەلا ئەکاو لێی ئەپارێتەوە ولالەو نزای لە گەلا ئەکاو ئەکەوێتە موناجات لەخزمەتیا .

بێ‌گومان ئەمەیش ئەوپەڕی پلەی بەندەیەتی‌یەکە پەرستن‌و پەرستشی بۆدانراوە . نوێژ - بە مەرجێ دلێ هۆشیارو ئاگاداری لە گەلابێ - دلێ ئەگەشێنێتەوەو دەروون پالفتە ئەکاو ئەی زرێنێتەوەو لەش پاك ئەکاتەوە گیان خاوێن‌و بەرز ئەکاتەوە ، وەمرۆڤ فێری ئادابی بەندەیەتی وپلەی خوایەتی ئەکا ، وەلە دلێ نوێژکەرا گەورەیی ودەستەلاتی خواو

نازو نیعمەت‌و چـاکەکانی لە گەڵیا ئەڕوێنێ ، وەنوێژکەر ئەڕازێنێتەوە بە ڕەوشت‌و خووە بەرزەکان. وەکو ڕاستی‌و دەست پاکی‌و قەناعەت‌و وەفاو هێمنی‌و گەردن کەچی‌و بێ‌فیزو هەوایی‌و داد پەروەری‌و چاکە کردن و بەگیانی‌یە بەزەیي و سۆزو یارمەتی‌و دۆستایەتی‌و خۆنەویستن وێنەیان ، وەنوێژکەر لە ڕیزی ئادەمیزاد بەرزتر ئەکاتەوە ولە فریشتە نزیکی ئەکاتەوەو ڕوي پێ‌ئەکاتە خوای گەورەو بەس .وەهەموو شتێکی ـ بێجگەلە خوای تاك‌و تەنیا ـ لە بەر چاو سووك‌و بێ بایەخ ئەکا ، لە بەر ئەمە هەمیشە هەر لە بیری خوادا ئەبێ‌و ئاگاداری ئەکاو هەر لە خوا ئەترسێ‌و هەر بە تەماي ئەو ئەبێ ، بەمە پایەي بەرز ئەبێتەوەو دوور ئەکەوێتەوە لە درۆو خیانەت و شەڕو غەدرو ڕق‌و قین‌و فێڵ‌و تەڵەکەو زوڵم و زۆرو هەموو جۆرە خراپەو نارەوایی‌یەکی‌تر ، وەبەم جۆرە مانای ئایەتە پیرۆزەکەی بەسەرا دێتەدی « ان الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر ١ » نوێژ ڕواڵەت‌و گیانی هەیە ڕواڵەتەکەی بریتی‌یە لەو کردەوانەی ئەندامەکانی لەش بەجێی دێنن بەپێی ئەو مەرج و پێویستی‌و بەشانەی لە کتێبي فیقها باس کراون .

گیانەکەیشي بریتي‌یە لە پەرستن‌و بەندەیەتی دڵ‌و دەروون بۆ خوا وەئەو دڵ‌و دەروونە وەکو ڕو بە نوری خوا ئەدرەوشێنێتەوە . نوێژ

١) العنكبوت ٤٥

وەرزشی لاشـــەیي ووەرزشي گیانيیە ، نوێژي ڕاستەقینە ئەبێتە هۆي پاك بوونەوەی نوێژکەر لە گوناهو نەفامی‌یەکان وەکو پێغەمەری خوا فەرموی : « ئەگەر ڕوبارێ لە بەردەمي مالێ یەکێکتانەوە بڕواو ڕۆژی پێنج جار خوێ تیا بشوا ئایا چلکي پێوە ئەمێنێ ؟ ووتیان نەء ، فەرموی دەي پێنج نوێژەکەیش بەو وێنەیە گوناه بە نوێژکەرەوە نایەلێ » نوێژ ئەبێتە دەرمان بۆ نەخۆشینی دڵو مێشك.وەسەری مرۆڤ بەرز ئەکاتەوە لە بەرابەری تەواوي گیان لە بەرەکان لە بەرابەرێي تەواوی گیتی وەئازادو سەر بەستي ئەکاو ئیتر لە کەس ناترسێ.وەژێر دەستەیی‌و داماوی‌و سەر شوڕی بۆ کەس ناکات.وەبێجگەلە خوا بەندەي کەس نابێت ، چونکە لە هەموو ڕکاتێکی نوێژەکەیا ئەلێ « الله اکبر » یاني خوا لە هەموو کەس ولە هەموو شتێ گەورەترە ، وەلە هەموو نوێژێکا چەند جار شایەتمان دێنێ وەبیر لەوە ئەکاتەوە کە هەموو ماناو وەسفەکانی خوایەتی هەر بۆ خوای پەروەردگار دائەنێ ( وەکو لە پێشەوە باسمان کرد ) وەلە هەموو ڕکاتێکا تـازەی ئەکاتەوە کە هەر خوا ئەپەرستێ بە تەنیا وەهەر داوای یارمەتی وەکۆمەکي لە خوا ئەکاو بەس وەئەلێ « إیاك نعبد وإیاك نستعین ١ » یانی ئێمەی موسلمان هەر تۆ ئەپەرستین وەهەر داوای یارمەتی لە تۆ ئەکەین .

---

١) الفاتحة٤

تێبيني : ووشەی ( عبد ) کە لە [ نعبد ] دایە بە چەند مانایەك لە ئیسلاما هاتووە وەکو : پەرستن وکڕنوش بۆ بردن ، یاوەکو شوێن کەوتن‌و پەیڕەوی کردن « ألم أعهد إليكم يا بني آدم ألا تعبدوا الشيطان ۱ » واتە ئایا بەلێنمان لێ وەرنەگرتوون ـ ئەی ئادەمیزادەکان ـ کە پەیڕەوی شەیتان نەکەن ؟ یا وەکو دڵ پێوەبەستن‌و پێوە خەرۆ بوون کە هەر بە دەوری ئەوا بسووڕێتەوە ، پێغەمبەر ئەی فەرمو : « عەبدي دینار وعەبدی درهەم وعەبدی کوتاڵ داماو ئەبێ » .

بێگومـان هەرکەسێ بە هۆش‌و گۆشەوە نوێژ بکاو ئەم مانایانە بێنێ بە دڵی خۆیاو سەرنجیان لێ بدا ئەو کەسە بە هیچ جۆرێ ناچێتە ژێری هیچ ئالاو بەرنامەو حوکم‌و فەرمانێك بێجگەلە هینی خوای گەورە وەهەمیشەو هەتا هەتایە ئامادە ئەبێ بۆ بەجێ هێنانی کاروبارو فەرمانەکاني خواي گەورەو پەروەردگار لە تەواوی ڕو ولە تەواوي ناوچەکاني ژیانا وەخۆي بەلێ پرسراوە ئەزانێ بۆ هەموو فرمانێکی ئیسلامي وەهەمیشە ولە هەموو شوێنێك ولە هەموو ئێش‌و کارێکیا هەر موسلمان ئەبێ‌و بەس وەبێجگە لە ئیسلام هیچ شتێکی‌تر بە ڕاست نازاني .

بەم جۆرە ئەتوانین بلێین : نوێژ نەك هەر یەکێك‌بێ لەپایەکانی ئیسلام بەلکو بە تەواوي ئیسلامەتي تیا ئەدرەوشێتەوە ، موسـلماني

۱) یس ٦٠

نوێژکەر لە نوێژەکەیا قورئان ئەخوێنێو ئەبینێ لەو قورئانەی کە خۆی یا پێشەوا « إمام » ي نوێژەکەي ئەی خوێنێ لە نوێژي کۆمەڵ « جماعة » دا باسي دۆزەخو بەهەشت ، یا باسی قەبرو قیامەتو موحاسەبەو تەنگو چەڵەمەیان ، یا باسی ئیشو کارەکانی جیهانيو کۆمەڵایەتی وەکو ئیشو کاري ژیان ، یا باسي کومەڵایەتيیا ئابووري یا ڕامیاري یا حوکم و فەرمان ڕەوایی یا زانیاريو ئاڕاستەکاري ، یا باسو ئەحکامي ئەحوالی شەخسی وەکو کڕین و فرۆشتن و نیکاح و تەلاق و نەفەقە و کەلە پوورو ... هتد ، یا جەنگ و هەراو ئاشتيو پەیمان و ڕێ کەوتن ، یا باسي داســـتاني ئومەتە پێشینەکان و هەڵوێستیان بەرابەری ئایینو پیغەمەرەکانیانو ئەنجامو ئاکامیان ، یا باسي سیفاتو گەورەیي خوا ... هتد . نوێژکەر لە نوێژا ئەمانە لەو قورئانەی ئەی خوێنێ یان ئەي بیستێ ئەبینێ کە نوێژ بکا. دەی ئایا ئەگونجێ خوێندنی قورئان « یاني ووتەکاني » پارچەیەك بێ لە نوێژ بەڵام ماناکەیو پەیرەوی کردني پێویست نەبێ لە سەر مرۆڤ ؟ لە گەڵ ئەمەدا قورئانیش بۆ سەرنج دانو پەیرەویو پێ هەڵسان نێرراوە ! بێگومان ناگونجێ .

لەمەی پێشەوە دەر ئەکەوێ ، کە هەر بە نوێژ کردن مرۆڤ ئەتوانێ ببێ بە موسڵماني تەواو. ئەگەر نوێژ بکات بە ماناکانيیەوە ، وە دەر ئەکەوێ کە ئیسلام پارچەو بەشەکاني لێك جیا ناکرێنەوەو یەکیتيیەکي

نەپچراوو نەپساویان لە نیوانا هەیە .

وە ئەو نوێژەی ئەو مانایانەی پێشەوە لە مرۆڤا دروست ناکاو نوێژکەر لە خراپەو ناڕەوایي ناگێڕێتەوەو نایکات بەگوێی ڕایەڵی قورئان وئیسلام ، یا نوێژکەر نابەستێتەوە بە ئیسلامەوە ئەچێتە ژێر باڵی ئەم و ئەوەوە ، یا پەیوەندي ڕاستەقینەی لەگەڵ خوای گەورەدا تیا دروست ناکات. ئەوە نوێژی تەواو نیە « با بەگوێرەي ڕوالەتي فیقهي داواي کردنەوەی لێ نەکرێ » وەئەو نوێژە لەخاوەنەکەي وەرناگیرێ و ئەدرێتەوە بە سەرو چاویا ، پێغەمەر « دروودی لەسەربێ » فەرموویە « هەر کەسێ نوێژەکەی لە خراپە نەي گێڕێتەوە ئەو کەسە هەر لە خوا دوور ئەکەوێتەوە » وە دەربارەی ئەوانە فەرموویە : « نوێژەکەی وەکو پەڕۆ شڕە ئەپێچرێتەوەو ئەدرێتەوە بە سەرو چاویا » . نوێژکاتي خوا پەرستیەکە بە دڵ هۆشیارەوەو بە گەردن کەچیەوە بەجێ بێت ، قورئان ڕزگار بووني موسڵمانانی بەستووە بە هۆشیاري دڵ و گەردن کەچيو خۆ توانەوە لە نوێژا « قد أفلح المؤمنون الذين هم في صلاتهم خاشعون ۱ » وەپێغەمەر فەرموویە : « پاداشي نوێژ تەنیا ئەوەندەي لێم تێگەیشتنیەتي » .

نوێژ دەست مایەي موسڵمانەو ئەبێ لە هەموو زەرەرەو زیانێ

---

۱) المؤمنون ۱ـ۲

بەتایەك بێپارێزێ ئەوەك قازانجو دەست مایەی لە دەست بچێ.نوێژ تازەکردنەوەی پەیوەندی‌یە لە گەڵ خوادا ، ئەبێ ئاگاداری بکات تا چ ڕادەیەك مانای پەیوەندی تیا هاتوەتەجێ ، وەهۆشی پێوەبێ ئەوەك ئەمە دوا پەیوەندی‌بێ‌و ئیتر تەمەنی جیهانی کۆتایی هاتبێ بۆیە پێغەمەر « درودی لە سەربێ » ئەی فەرموو : « صل صلاة مودع » یانی نوێژی ماڵ ئاوایی‌و خوا حافیزی کردن بکە .

## شێوەی بە جێهێنانی نوێژ :

نوێژ - هەروەکو پەرستشەکانی‌تر - دارای چەند مەرج وبەش‌و سوننەت و ئادابێکی ئەوتۆیە کەلەم نامیلکەدا باس ناکرێ وەلەکتێبە فیقهی‌یەکانا بەدرێژی باس‌کراون ، وەئەوەی کەشیاوی باس‌بێ لیرەدا ئەوەیە ئەڵێن :

نوێژ تەحی‌یە « تحية » یەکە ، یانی هاتنە خزمەت و سوپاس کردنێکە کە بەندەی نازو نیعمەت پێدراوو موچەو سامانی زۆر پێبەخشراو هەرکاتە ئەکاتێ ئەچێتە خزمەتی ئەوگەورە خاوەن چاکەیە سەلام و ڕێزی پێش‌کەش ئەکاو سوپاسی ئەبڕاوەی بۆ تازە ئەکاتەوەو بچوکی و نانەخۆری خۆی دەرئەبڕێ‌و باسی بەخششەکانی‌ئەکاو ووت‌و ویژو پاڕانەوەی لەگەڵا ئەکاو داوای بەردەوامی ئەو بارانەی لی‌ئەکاو

ئادابی کەمەربەستەیی دەرئەبڕێ وەلە دوای پێکهاتنی مەبەستەکەی بە شەرمەوە ئەگەڕێتە دواوە و دەم و دڵێ هەرخەریکی باس و خواسیەتی.

بەم پێیە ئەو بەندە بەوەفایە بەیانی زوو کەلەخەو هەڵسا و نیوەڕۆ کەلەئیش دەستی هەڵگرت و شەو لەپاش شێو کردنەوە و پشوودان ئەم بچوکی و تەحییەیە بەجێدێنێ.

وەئەگەر ئەو گەورە خاوەن چاکەیە پێی ڕابگەیەنی: هەتا تۆ ئەم شیوەیە بەجێبێنی من ڕوی میهرەبانیم لەگەڵتا زیاترئەبێ و خۆشەویستتر ئەبی و زیاتر بەخششت ئەدەمێ.

بێگومان لەجیاتی ڕۆژی پێنج جار پەنجاجار ئەو شێوەیە بەجێ دێنێ، بەڵکو لەوانەیە هەر ئاسانەکەی بەجێ نەیەڵێ.

وەئاشکرایە ئەو کەسە هەوڵ ئەدا بەشێوەیەکی پاك و خاوێنەوە بۆ دەست و دەم و ڕوی و قاچ و قول و بەرگ و کاڵاو لاشەی پاك ئەکاتەوە و ئەیەوێ شیرینترین دیمەن و جوانترین ڕواڵەت و وێنەی هەبێ و هەمیشە لەجێگایەکی خاوێنا و ڕوبەڕوي ئەو گەورەیەی ڕا ئەوەستێ وەنایەڵێ هیچ لاشەیەکی بەدەرەوەبێ ـ بێجگە لەوشوێنانەی بە دەرەوەن ـ وەهەوڵئەدا هەموو گیانیبکا بەگوێ بۆبیستني فەرمایشەکانی وەزۆر بەئاگاداري و هۆش و گۆشەوە لەگەڵیا ئەدوێ.

وائەزانم بەم نموونەیە توانیمان نوێژکردن و ژمارەی نوێژو

دابەش‌کردنیان بەسەر کاتەکانا و مەرج و ماناو بەش و مەبەستەکاني لە دل و چاووگوێی خوێندەوارانەوە نزیك بکەینەوە ، وەڕوون بووەوە بۆمان کە ئەبی نوێژ بەپاك و خاوێنیەوە بکرێ لەلاشەو کالاو بەرگ‌و جێگاي نوێژا ، وەپێویستی هەیە بە داپۆشیني لاشەو «عورة» وەبەڕو کردنی لاشە بۆ شوێنی هەڵقولیني ئایین وەبە ڕوکردني دڵ بولای خوای پەروەردگار بەهۆشیاری و شەرم و ئاگاداریەوە .

مرۆف لەیەکەم جارا کە نوێژ دائەبەستێ ئەڵێ : « الله اکبر » یانی خوا لە هەمووکەسێ گەورەترە ، بەم ووشەیە یەکسەر خوێ لە دەست هەمووکەس ڕزگارئەکاو خوێ ئەخاتە ژێر سایەی گەورەترین کەس کەخوایە و سەری بەندایەتی بۆ خوا شۆڕئەکاو سەری لە عاستی هەموو کەسێکی‌تر بەرزئەکاتەوە . ئەنجا لە خوا ئەپاڕێتەوە کە لە هەڵ خەڵەتاندن و فریودانی شەیتانی ( دوورخراوەو دەرکراو ) بی پارێزێ وەدەست ئەکا بەخوێندنی سوورەتی « فاتحة » وەئەڵێ : « بسم الله الرحمن الرحیم » یانی من ئەم پەرستن و بەندایەتی و بچوکی خوٚمە بەجێ‌دێنم و دەست پێ‌ئەکەم بەناوي بەخشندە و میهرەبان و خاوەنی بەخششی بەلێشاو ، لێرەدا دەری‌ئەبڕێ کە بەخشندەیی‌خوا زۆرو بە لێشاوەو لە ژمارەنایەت « وإن تعدوا نعمة الله لا تحصوها » ١ یاني ئەگەر

---

١) النحل ١٨

بتانەوێ نیعمەتەکانی خوا بژمێرن بۆتان ناکرێ چونکە لەژمارەنایەن « الحمد لله رب العالمین » سوپاس هەربۆ خوایە کەوا پەروەردگار و پەروەرش کەرو پێگەیەنەری گیتی‌یە بەهەموو جۆرەبەش‌و پارچەکانیەوە. لێرەدا دەری ئەبڕێ گەورەیی و چاکە و دەستەلاتی بێوێنەی خوا لە لایەکەوە، وەلەلایەکی‌ترەوە پیشانی‌ئەدا کە گیتی بەهەموو بەشەکانیەوە یەکێتی‌هەیەو هەموویان لەیەك سەرچاوەوە هاتوون‌و دۆست و پشتیوانی یەکترن « نەك وەکو هەندێ فەلسەفەی تەنگەلان کە بەدوژمنی یەکیان دائەنێ » وەبەتایبەتی مرۆڤەکان یەك خێزانن‌و یەك‌خوا دروستی‌کردوون وەهەر خوێشی سەرپەرشتی‌یان ئەکات.

« الرحمن الرحیم » خوایەکی خاوەن بەزەیی و سۆزو میهرەبانە لەگەڵ ئەو هەموو نازو نیعمەتەی ئەی بەخشێ پەیوەندی بەندەکانیەوە شێوەی دڵنەرمی و خۆشەویستی هەیە، دووبارەکردنەوەی ئەم دوو ووشەیە ئەوەئەخاتە بەرچاو: کە نوێژکەر لە « رب العالمین » مانای ترس و بیم و زۆر نەچێتە دڵی‌یەوە و تێبگا کە بەوگەورەیی و دەستە لاتەیەوە زۆر میهرەبان و خاوەن سۆزو بەزەیی‌یە « مالك یوم الدین » هەر خوێ خاوەنی ڕۆژی دوایی‌و پاداش‌دانەوەیەو کەس لەو ڕۆژەدا هیچی بەدەست‌نیە. ئەمەیش ئەوەئەگەیەنێ مرۆڤ ئەبێ هۆشی بەخۆی بێ‌و بەو میهرەبانی و سۆزی خوایە خەڕۆ نەبێ. کەوا بەتەمای ئەوەوە

کەمتەرخەمي بکاو گوێ نەداتە ئیش و کاری ، وەئەبێ بزانێ پاشـــە ڕۆژێکي وا هەیە تەنیا بەدەست خوایەو لەو ڕۆژەدا بەپێی کردەوە پاداش ئەدرێتەوە بە چاکە یا بەخراپە ، نەك بەگوترە و مـاشەرایي ، ئینجا نوێژکەري دڵ ووریا ترسي لێ‌ئەنیشێ‌و بەهەموو دڵ و دەروون وەگیانیەوە هاوار ئەکاو ئەڵێ :

« إياك نعبد وإياك نستعين » یانی ئەی خوای گەورەو پەروەردگار ومیهرەبان‌و بەخشندەو خاوەنی ڕۆژی پاداش دانەوە ، ئێمە ـ موسڵمانان ـ هەر تۆ ئەپەرستین و هەر بەندەی تۆین و هاوار تەنیا بۆ تۆ دێنین و هەر شوێن حوکم‌و فەرمان‌و یاسای تۆ ئەکەوین‌و تەنیا لەسەر بەرنامەو پروگرامەکەی تۆ ئەڕۆین و هەر لە تۆ ئەترسـین و داوای یارمەتی و کۆمەکی تەنیا هەر لە تۆ ئەکەین لە هەمو ئیش‌و کارێکمانا چ بۆ ئەم جیهان‌و چ بۆ ئەو جیهانمان . لێرەدا نوێژکەر ئەبێتە موسڵمانی ڕاستە قینەو بەندەی تەواوی خواو بەمەیش سەری لە عاستي هەموو شتێ یا کەسێکی‌تر بەرز ئەبێتەوە لە هەموو بەندایەتی‌یەکی ڕزگاری ئەبێ‌و سەر بەستی‌و سەر فرازی تەواو وەرئەگرێ‌و هەموو جیهان‌و گیتی بەلایەوە بێ بایەخ ئەبێ چونکە بوەتە بەندەی ڕاستەقینەی خوا « إهدنا الصراط المستقيم » یانی ئەی خوای ئێمە تۆ بەگەورەیی خوت ئێمە بخەرە سەر ڕێگای ڕاست‌و ڕەوان « کە ئیـسلامەتی‌یە » ولە سەری ڕامان

بكره تا لێ لا نەدەین وسەرمان لێ نەشـــێوێ‌و گومڕا نەبین‌و ڕێ نموویی‌مان‌بکە بۆ سەر یاساو بەرنامەکەی‌ئیسلام کەهەر ئەوە ڕێگای ڕاست «قوآن: هذا صراطی مستقیماً فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بکم عن‌سبیله ١» واتە ئەم ئاینی ئیسـلامە ڕێگاو بەرنامەی ڕاستی منە دەی ئێوە بچنە سـەری و بەڵام نەکەن بکەونە سەر ڕێگاکانی‌تر چونکە لە ڕێگاکەی خوا لاتان ئەدەن وگومڕاتان ئەکەن‌و بڵاوەتان پێ‌ئەکەن وپەرتەوازەتان ئەکەن .

« صراط الذین انعمت علیهم » یانی ئەو ڕێگاو بەرنامەیەی کە ڕێ‌و شوێنی پێغەمەران‌و پیـاو چاکانە ئەوانەی تۆ نیعمەتی ڕاستە قینەی خۆت‌و بەرنامەی شیرینی خۆت پێ بەخشیون‌و پێیانت شایستە بینیوەو ئاگاداریت کردون تا سەریان لێ نەشێوێ‌و لە ڕێ لانەدەن .

« غیر المغضوب علیهم ولا الضالین » واتە نەك ڕێگای ئەوانەی لە بەر خراپەو بەدڕەوشتی یان خەشم‌و قینی تۆیان لێ کەوتوەتە کارو سەریان لێ شێواوەو تۆیش لێیان ڕەنجاوی وەنەك ڕێگەی گومڕاهان کە نایانەوێ ڕێگای ڕاست بدۆزنەوە.ئینجا ئەپاڕێتەوە لە گەڵ ترس‌و هیواداو ئەڵێ : ( آمین ) خوایە تۆ ئەم بەندەیی‌و پەرســــتن‌و نزاو پارانەوەیەم گیرا بفەرمو .

---

١) الانعام ١٥٣

## تێبینی :

لەم سورەتە پیرۆزەدا چەند شتێك ئەدا لە دڵی نوێژکەرو سەرنج دەری دڵ هوشیار :

١- موسڵمان لە هەموو ئیش‌و کارێکیا ئەبێ بە ناوی خواوە دەست پێ بکا وەباسي بەخشندەیی‌و میهرەبانیشی بکا .

٢- لە کاتی دەست پێ‌کردنی بەئیشەکەی سوپاسی‌پەروەردگار بکا

٣- ئەم سورەتە یەکیەتی‌و تەنیایی خوا لە جوانترین دیمەنا پیشان ئەدا . ئەوەتە ئەڵێ : سوپاس هەر بۆ خوایە ، هەر خۆی پەروەردگارو پەروەرش کەرە ، هەر خۆی خاوەنی ڕۆژی پاداشەو سەر پەرشتی پاداش دانەوە ئەکات ، وەموسڵمانان ئەڵێن هەر تۆ ئەپەرستین وەهەر بەندەی تۆین « بەو مانایانەی لە پێشەوە لێی دواین » وەداوای یارمەتی و کۆمەکی هەر لە تۆ ئەکەین و هاوار هەر بۆ تۆ دێنین ، هەر تۆ ئەتوانی بمان خەیتە سەر ڕێگای ڕاست ولە سەری ڕامان بگری‌و نەیەڵی سەرمان لێ بشێوێ یا خەشمان لێ بکەوێتە کار کەواتە هەر لە تۆ ئەپارێنەوەو هەر لە تۆ ئەترسین .

٤- ووتني ووشەي « العالمین ، نعبد ، نستعین ، إهدنا » بە شێوەی واتەی کۆمەڵایەتي بانوێژکەر بە تەنیا ولە شوێنێکی چۆڵ‌و

هوڵیشا بێ ئەوە ئەگەیەنێ کە ئاییني ئیسـلام ئاینێکی کۆمەڵایەتی‌یەو موسڵمانـان یەکێ‌و ئەبێ یەك پارچەبن‌و یەکیتي تەواویان هەبێ‌و هەر یەکەیان بۆ ئەوانی تریان بژین‌و هەر یەکەیان خۆی بەخشتێ بزانێ لە قەڵای بەرزی کۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتی‌یانا وەئەبێ لە تایبەتی‌ترین ئیشیانا لە گەڵ ئەوانی تریانابن .

بە ڕاستي ئایینی ئیسلام لەم گۆشەی یەکیتي‌یەدا بەرزترین خزمەتی کردووەو جوانترین بناغەی بۆ داناوە ، لە زۆر ئایەت‌و فەرموودەدا ئەم ماناو مەبەستە ئەچەسپێنێ‌و موسڵمانان بەڵکو مرۆڤایەتی بە ڕویەکی گشتي ئەکات بە برای یەك‌و دەری ئەخا کە هەموویان لە یەك نەژادن وبەرەبـاێکن ولە پیاوو ژنێك دروست کراون‌و یەك خوایان هەیەو ئەبێ یەك بن‌و پێکەوەو بۆ یەکتری بژین‌و چی‌یان بۆ خۆیان ئەوێ بۆ موسڵمانەکانی تریش ئەوەیان بوێ‌و . . . هتد وەهەر وەها موسڵمانانی دێ یان گەڕەك ڕۆژی پێنج جـار کۆئەبنەوە بە هۆی نوێژی کومەڵ « صلاة الجمعة » وە ، وەموسڵمانانی شارو ناوچە هەفتەی جـارێك بە هۆی نوێژي جومعەوە لە شوێنێکا کۆئەبنەوە ، وەساڵی دوو جـار بە هۆی نوێژي جەژنەکانەوە کۆئەبنەوە ، وەهەموو ساڵێك جارێ هەرچی موسڵمانێ دەستەڵات‌و توانای هەبێ لە هەموو لایەکەوە ڕو ئەکەنە شوێني هەڵ قوڵینی ئیسلام ولە حەجا کۆبونەوەیەکی گشتي موسلمانان

ئەکەن . خو ئاشکرایە فەلسەفەو سوودي ئەم کۆبونەوانە پتەو کردنی یەکێتیو بە یەکا بوونەو ئاگاداری‌یە لە حالی یەکتری . . . وهتد .

ئینجا نوێژکەر لا ئەکاتەوە بەلای قورئانی پیرۆزەوە سوورەتێ یا هەندێ‌تر لە قورئان ئەخوێنێ بۆ ئەوەی بیری لێ بکاتەوەو لە دەریای بێ‌بەي قورئان هەندێ‌تر هەڵ گلازێو فێري هەندێ لە دەستوورەکانی بێ وشتێ لە زۆشتەکانی هەڵ بگرێ تابیکاتە سەر مەشق بۆژیانیو بۆ پاشە ڕۆژي کارێکی وابکا بە سەربەرزي بچێتە دیواني خواوە .

کە نوێژکەر لەوە بووەوە خۆي خوار ئەکاتەوەو ئەچێتە ڕکوعەوە « رکوع » ومل کەچی خۆي بەرابەري گەورەیی خوا دەر ئەبڕێو تەسبیحاتی خوا ئەکا ، ئەنجا بەرز ئەبێتەوە ڕێك ڕائەوەستێو سوپاسي خوا تازە ئەکاتەوە وله پاشا سەري بەندەیی ئەنێتە زەويو کورنوش ( سجده ) ئەبا بۆ خواي گەورەو ڕوي بۆ ئەخاتە سەر زەوي وئەوپەڕي پلەي بەندەیەتی پیشان ئەدا ، ودوو جار ئەم کورنوشە ئەباو لالەو پارانەوەو تەسبیحاتی تیا ئەکات ، بەم ڕەنگە تالێ ئەبێتەوە ، لە پاشا بەشەرمو ئەدەبەوە دائەنیشێو تەحیە ( التحیة ) ي ڕاستي پێشکەش ئەکا ـ وەکو ماڵ ئاوایي بکا ـ ئەڵێ : هەموو تەحیەو سوپاسو چاکەو گەورەیی‌یەك هەر بۆ خوایە سەلامو ڕەحمەتو بەرەکاتي خوا لە سەر تۆ بێ ئەي پێغەمبەرو ڕێ پیشاندەرو رابەرو ماموستاي بەڕیز کە ئیمەت

گەیاندووە بە خوا ناسین « وەلەو کاتەدا لە دڵی خۆیا پێغەمەر حازر ئەکاو ئەم نزایە بۆ ئەکاو سوپاسی ئەکا » وەسەلامیش لە سەر ئێمە ولە سەر هەموو موسڵمانە چاکو ڕاستەکانیش بێ ، وەلێرەدا شایەتمان دێنێتەوە وپەیمانەکەی تازە ئەکاتەوە ، ئینجا داوای باریی دروود ئەکا بۆسەر پێغەمەرو یارو دۆستەکانی دوایی ئەکەوێتە پاڕانەوەو مەبەستی خۆی دەر ئەبڕێ لە داواکەیا ، ئینجا کۆتایی بە نوێژەکەی دێنێو سەلام ئەداتەوە . ئەم لێکۆڵینەوەیە هەرچەند سادە بوو بەڵام دەری خست کە کامەیە نوێژی ڕاستەقینە کە نوێژکەر لە خراپە لائەدا ، وەپێغەمەر ( دروودی لە سەربێ ) بە کامەی ئەووت : « چاوم بە نوێژ کردن ڕوون ئەبێتەوە » ونوێژ بە کورتی ئیسلامەتی دەر ئەخا ، وەنوێژکەر ئەبێ بە تەواوی بەشەکانی ئیسلام بەجێ بێنێ نەك ئەو نوێژەی سادەو بێ تام بێ وەکو منو تۆ .

****

## پایەی سێ٢هەم لەئیسلاما :

# زەکات دانە

زەکات‌دان یەکێکە لە بەش و لەپایەکانی ئیسلام ، وەپێویستێکە لە پێویستەکاني ئیسلام زۆر بەگرنگەوە سەیری زەکات ئەکات ، نابینی لەهەر شوێنێکا لەقورئان یا لەفەرموودەدا باسي نوێژئەکات بەزۆري بە دوای ئەوا باسي زەکات ئەکات ، نوێژو زەکات دوو پایەی مەحکەم‌و دارێژراون لە پایەکاني ئیسلام ، قورئان ئەفەرموێ :

« فأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة »١. واتە نوێژبکەن وەزەکات بدەن وەقورئان برایەتي نێواني موسڵمانان لەسەر ئەم دووانە هەڵ ئەسێنێ.
[ فان تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فاخوانكم في الدين ٢ ] واتە ئەگەر پەشیمان بوونەوەو نوێژیان کردو زەکاتیان‌دا ئیتر برای ئاییني ئێوەن وەزەکات بە پاك کەرەوە دائەنێ ( خذ من اموالهم صدقة تطهرهم وتزكيهم بها ٣ ) یانی زەکات لە ماڵیان وەربگرەو پاکیان بکەرەوەو باڵفتەیان بکە پێی . واتە بە دانی ئەوهەقەی ئیسلام لە سەری داینا‌وە

١) الحج ٧٨ ٢) التوبة ١١ ٣) التوبة ١٠٣

ماڵ و ودڵ و گەردنو دەرونی پاك ئەبێتەوە ، پاك کەرەوەی ماڵ لە هەقي موسڵمانان وبەرەکەتی تێئەکەوێ . پاك کەرەوەی دڵ و دەرونە لە پیسکەیی‌و چروکی‌و رژدی‌و هەر بۆخۆویستن ، چونکە دڵو دروون کە پـاك بوەوە گوشاد ئەبێ‌و بەخشندەیی تیا ئەروێ پاك کەرەوەی گەردنە لە هەقي خەڵکی‌و ئازاد ئەبێ .

زەکات پێویستێکی ماڵی‌یە هەر چۆن نوێژ پێویستێکی لەشی‌یە ، هەرچۆن مرۆڤ بە نوێژ کردن پەیوەندی لە گەڵ خوادا ئەبەستێ ، بەزەکات دانیش پەیوەندی لە گەڵ مرۆڤەکانا ئەبەستێ ، وەئەم پەیوەندی‌یەش ئەبێتە هۆی پتەو کردنی یاسای کۆمەڵایەتی وپەیوەندی لە ناو کومەڵا وەدەرگاي خۆشەویستيو یارمەتی‌و هاری‌کاری ئەکاتەوە . ئیسلام دان نانێ بەیاسای چینایەتی‌دا ( نظام الطبقات ) ونارازی‌یە لە دابەش بوونی سامان بەشێوەیەك کە هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵ سامانی گەورەیـان هەبێ‌و بەوپەڕی خۆشی‌و دەستەڵاتەوە بژین کەچی بەشتێکی گەورەلە کومەڵی هەژارو بێ نەواو کەم دەس‌و برسی‌و ڕووت و قووت بن وەهەناسەی سارد هەڵ کێشن

لە بەر ئەمە وەبۆ ئەوەی ترازوی دابەش کردنی سامان بەسەر کۆمەڵا هاوتایی‌و لارەسەنگ نەبێ پێویستي گێڕاوە لە سەر دەوڵەمەنەکان هەموو ساڵێ بەشێ لە سامانەکەیان جیا بکرێتەوەو بدرێ بە هەژارو کەم

دەسەکان ولە پرۆژە گشتی‌یەکانا سەرف بکرێ وەئەو بەشەیشی دیاری کردووەو پێی ئەڵێ : ( زەکات ) . بەم کردەوەیە لە لایەکەوە هەژارەکانیش لەگەل دەوڵەمەندەکانا ئەژین‌و ژیانیان بۆ ئاسان ئەکرێ وەلە لایەکی ترەوە ترازوی دابەش کردن رێك رائەوەستێ ، واتە جیاوازی بە رادەیەکی نارێك‌و ناشرین نابێ ، قورئان ئەفەرموێ : ( کی لا یکون دولة بین الأغنیاء منکم ١ ) یانی بۆ ئەوە سامان دابەش ئەکرێ بە سەر هەمووانا هەتا سامانەکە هەر لە ناو دەستی دەوڵەمەندەکانا نەمێنێتەوە لەمیانەوە بۆ ئەویان ، بەڵکو بە ناو تەواوی کومەڵا بلاوە بکا .

ئیسلام ئەچێ بەگژ کۆبونەوەی ماڵ‌و سامان لە ژێر چەند دەسێکا وئەو لارە سەنگی‌یە لە ترازوی دابەش کردنا لا ئەبا وەبێجگەلە زەکات دان چەند رێگایەکی تری بۆ بلاو کردنەوەی سامان داناوە وەکو : ئیرس ( الأرث ) واتە هەر کەسێ مردکەلە پورەکەی بلاوە ئەکا بە ناو خزمەکانیا ، یا وەکو نەفەقە ، هەر کەسە ئەبێ چەند کەسێکی خزم‌رخویێشی خۆی بە خێوکا ، یاوەکو کەفارەت ( کفارة ) هەرکەسێ لاریێ‌یی کرد ئەندازێکی دیاری لە سامانەکەی لێ‌ئەسێنرێ یاوەکو خێرو سەدەقە ( صدقة ) کە ئیسلام زۆر هەتەرو سوورە لە سەری وبەگەرمی

---

١) الحشر ٧

داوای ئەکا لە موسڵمانـان وبەڵێنێ گەورەو پاداشی باشیان ئەداتێ لە سەری ، وەبێجگە لەمانەیش نابێ لە ناو کۆمەڵا برسی بێ بەبێ خۆراك وتینو بەبێ ئاوو ڕووت بەبێ بەرگ‌و هەژار بەبێ جێگاو گەنج بەبێ ژن یا بەبێ شوو ... هتد بەڵکو ئەمانە هەموویان ئەبێ لە ماڵی خاوەن دەستەڵاتەکان پێویستی‌یەکانیان جێ بەجێ بکرێ ، قورئان ئەفەرموێ : ( وفي اموالهم حق للسائل والمحروم ١ ) واتە لە ماڵی دەوڵەمەندەکانا بەشی سواڵ کەرو هەژارو بێ‌نەوایان هەیە ( وانفقوا مما جعلكم مستخلفين فيه ٢ ) واتە لەو ماڵە سەرف بکەن لە ڕێي خوادا کە خوا ئێوەی بەجێ نشینی خۆی لە سەر داناوە . وەپێغەمەر ( درودی لە سەربێ ) فەرموویە :

« خەڵکی هەر شوێنی مرۆڤێك بەبرسی لە ناویانا ڕۆژ بکاتەوەو تێری نەکەن ئەوە زمە ( زمة ) وپیمان‌و بەڵێنی خوا بۆ ئەوانە نەماوە »

وە جارێکیان فەرموی :

« بەخوا باوەڕی نیە ( واتە موسڵمان نیە ) هەتا سێ جار ، ووتیان کێ ئەی پێغەمەری خوا ؟ فەرموی ئەوکەسەی بەتێری شەو بکاتەوەو دراوسێکەی برسی بێ‌و ئەویش پێی بزانێ‌و تێری نەکا » .

وە ئیمامی ( عمر ) خوا لێی ڕازی بێ فەرموی « ئەگەر ئەوەی

---

١) الذاريات ١٩ ٢) الحديد ٧

ئیستا بوم دەرکەوتووە ئەوسا ئەمزانی زیادەی مالی دەولەمەندەکانم ئەسەندەوەو ئەم دا بەهەژارەکان » وەجۆرەها بەلگەی تریش بۆم مەبەستە هەیە .

ئیسلام هەلی ئەسیٚ بەم کردەوەیە : چونکە ئەو کۆبونەوەی سامانە لە چەند شوێنیکا لە لایەکەوە ئەبێتە هۆی یاخی بونو خۆ لێ گۆڕانی دەولەمەندەکان ( کلا إن الانسان لیطغی أن رآه استغنی ۱ ) واتە سروشتي مرۆڤ وایە ئەگەر خۆی وابینی کە ئیحتیاجیو پێویستی نیە یاخیو گومڕا ئەبێ ، وەلەلایەکیترەوە ئەبێتە هۆی پەیدا بوونو دروست بوونی بەخیلیو ڕقو قینو ناخۆشیو پشێویو ئاژاوەو جۆرەها نەخۆشی کۆمەلایەتی وەکو دزیو بێئابروییو خراپکاری ، وەشیرازەی ئاسایشو هێمنی ئەپچڕێ .

## پلەی زەکات لە یاسادا

زەکات ئەبێتە هۆی بەرپابوونی یاسای ئابوریو یاسای کۆمەلایەتی لەیەك کاتەوە بتەویان ئەکات ، وە ئەبێتە هۆی ڕاست بوونەوەی یاسای : بۆ یەکتر بوونی کۆمەلایەتی ( التکافل الاجتماعي ) وە یاسای : دەستە بەری کۆمەلایەتی ( التضامن الاجتماعي ) لە ناوکومەلا .

---

۱) العلق ٦ ، ٧

### ڕەخنەو وەلامی :

هەندی لە دوژمنانی ئیسلام وەدوای ئەوانەوە شوێن کەوتوەکانیان‌و تێنەگەیشتوان لە دژی یاسای ئابوری ئیسلام ئەدوێن : گوایە ئیسلام یاسای ئابووری لەسەر خێرو زەکاتی دەولەمەندان دامەزرێنی وەموسلمانەکان بەسوال‌و دەست پان‌کردنەوە ئەژێنی ، بێ‌گومان ئەمەیش سوکی‌و ریسوایی ئەگەیەنی‌و شایانی مروفی ئازادو سەربەخو نیە .

لە وەلاما ئەلیم : ئەو کەسانەی بەم جورە رەخنانەوە خویان خەرو ئەکەن یا خو دلی خویانی پێ‌خوش ئەکەن ئەوانە خەیالیان خاوە، چونکە ئایینی ئیسلام چیایەکی گەورەیەو بە پەلەپیتکە ناروخی‌و لەرەی پێ‌ناکەوێ ، وە بو دەم کوتی ئەوانە پێم‌خوشە بە کورتی هەندێ لە یاسای ئابوری ئیسلام بدویم .

### یاسای ئابووری لە ئیسلاما (١)

هەرچەندە باسەکەمان وابەستەی بەزەکاتەوە هەیە بەتایبەتی بەلام بەشێوەیەکی ( لێ هەل‌کەوتن ) بە کورتی هەندی لەباسی ئابووری ئیسلام ئەدویم .

ئایینی ئیسلام ( وەکو بیروباوەرێکی گشتي ) ناوچەی ئابووری

---

(١) بوئەم باسە سەیري پەراوی « السلام العالمي والاسلام » بکە لە نوسینی سید قطب .

شان بەشانی ناوچەکانی تر هێناوەو رێكوپێکی کردووە : ( دەسەبەری ژیانی بەرێزی ) کردووە بەندێكو پیویستی گێڕاوە لە سەر کۆمەڵی موسڵمانان ( وە لە سەر حوکومەتی ئیسلامی کەنوێنەری موســـڵمانانە ) ئامادەکردنی ژیانی لە بەرگی رێزو شەرەفـا بۆ هەموو کەسێ « واتە بۆ هەموو مروڤێ ، موسڵمان بێ یان نە » لە پێشەوە باسمان کرد کە نابێ مرۆڤ موحتاج بێو ئیحتیاجی‌یەکەی بۆ بەجێ نەهێنرێ ، دیسان ئیمامی ( عمر ) خوا لێی رازی بێ موچەی بڕی‌یەوە بۆ منال ســەد درهەم وەکە گەورە بوو بۆی ئەکرد بە دووسەد درهەم ، وە بۆ منالی بێ‌کەس موچەیەکی دیاریی ئەبڕی‌یەوە ، وە بۆ پیرو پەك کەوتوی گاورو جولەکە بەشی دیاری دائەنا . وە زیاتر لە مانەیش بەگوێرەی مبدەئی بەرزی ئیسلامی : « پیاوو خزمەتی‌و پیـاوو پیویـستی » ئامادە کردنی ژیان‌و پێویستی بۆ هەموو مرۆڤێ .. دیسان ئیسلام هەوڵ ئەدا بۆ خستنە ئیشی مرۆڤەکانـەوە ، وە زۆر سـەنای ئیش‌و ئیش‌کەر ئەکا . پێغەمبەر ( دروودی لەسەربێ ) ئەي فەرموو : « خوا بەندەی ئیش‌کەری خۆش ئەوێ » وە ئەوەی فەرموو : « هەرکەسێ بەماندوویەتی لە ئیش‌کردنـا شەو بکاتەوە کە بەیانی هەڵســا خوا لێی خۆش بووە » ( وە جارێك پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرو ســـــواڵی کرد پێغەمبەریش دای‌ناو ناردی ئەورو پەتیان بۆ هێناو فەرمووی : « برۆ بە کۆڵ دار بێنەو خـۆت‌و

خێزانەکەتی پێ بە خێوکەو دوایی سەرم لێبدەرەوە » .

ئیسلام رێنادا بەموسڵمانان بە خوا پەرستی تایبەتی‌یەوە خەریك بن‌و واز لە ئیش کردن بێنن : « عمري کوری خەتاب چووە مزگەوت و سەیری کرد کۆمەڵێ خەریکی خوا پەرستین ، فەرموی : ئەوە چی ئەکەن ؟ ووتیان : وازمان لە جیهان هێناوە بۆ خوا پەرستی . فەرموی : ئەی بەچی ئەژین ؟ ووتیان : پشت ئەبەستین بەخوا (واتە بە یارمەتی موسڵمانان ئەژین ) عمر بە دار بەربووە سەروچاویان و فەرموی : ئێوە ئەزانن ئاسمان نەزێر ئەبارێنی‌و نەزیو برون بۆ خوتان ئیش بکەن » .

ئینجا ئیسلام یاساکەی لە ئابوری‌دا دائەمەزرێنی لە سەر چەند مەبدەئێك :

**مەبدەئي یەکەم :**

سامان هەر لە ژێر دستي دەوڵەمەندەکانا نەمێنێتەوەو بلاوە بکا بە ناو کومەلا بە هەژارو دەوڵەمەندیەوە . ئایاتی قورئان راستەوخۆ ئەم مانایەمان ئەداتێ ( كي لا يكون دولة بين الاغنياء منكم ١ ) .

---

١) الحشر ٧ .

**مەبدەئی دووەم :**

مەبدەئی « بەرژەوەندی گشتی » ( المصالح المرسلة ) ئەویش ئەو بەرژەوەندی‌یە گشتي‌یانەی بە تایبەتی ئیسلام لیّیان دواوەو ئەیان داتە دەست دەولەتی ئیسلامي کە بە گوێرەی پیویستی تیایانا سامانی سەر مایەدارەکان وەربگرێ‌و خەرجیان بکات (١) .

**مەبدەئی سی‌یەم :**

مەبدەئي ( ري گرتن ) « سد الذرائع » یاني رێ گرتن لەو شتانەی سەر ئەکێشن بۆ خراپە ، ئەوەی شایانی باسە لێرەدا کۆبوونەوەی سامان لای چەند کەسێ سەر ئەکیشی بۆ گوناهو خراپە ، وەخراپەیش ئەبي ریگاي لێ بگیرێ . لە بەر ئەوە نابێ رێگا بدرێ بەکۆبونەوەی سامان لە لای چەند کەسێ (٢) .

ئیسلام زۆر بە توندی لە سوو ئەدوی‌و بە خراپ‌و تاوانی گەورەی دائەنی وەبە هیچ جوری لە ئیسلاما سووکاری رێگای نادرێ ، خۆ بێ‌گومان سوو یەکەم هویە بو کوبوونەوەی سامان وبۆ پێك هاتني سەرمایەداری وبۆ دروست بوونی چینایەتی لە ناو کۆمەلا .

---

١) سەیری کتیبی «مالك» لە نووسیني أبو زهرة بکە .

٢) سەیری «مالك» بکە .

**مەبدەئي پينجەم :**

قەدەغەو یاساخ کردني دەست بە سەرا گرتن ( الاحتکار ) ە ئەمەیش بریتي‌یە لە دەست گرتنی چەند کەسێ بە سەر بەرو بووم و کەل‌و پەل یا هۆیەکاني بەرو بووما وەتەنیا هەر بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆي بلاوی بکاتەوە ، ئەمەیش ئەبێتە هۆي تێك چوني ترازوی دابەش بووني سامان‌و پێك هاتنی سەرمایە داری‌و چینایەتی‌و ئیسلام رێگای نادا .

**مەبدەئي شەشەم :**

مەبدەئی ( گیرانی سـەر چاوە گشتي‌یەکانی بەرو بووم بە ماڵی کومەڵ یان دەوڵەت کە نوێنەری کومەڵە ) « تأميم المرافق العامة » . ئەمەیش بە چاو کردن لە گیرانی ( ئاوو ئاگرو گیاو پوش ) کە فەرموودە کردونی بە ماڵی گشتي .

بە گوێرەی ئەمە هەموو سـەر چاوە گشتي‌یەکان وەکو نەوت و کانکاکان‌و ئاوو کارەباو دارو بەردو شەریکات‌و بەریدو ... هتد ماڵی گشتین‌و دەوڵەت سەر پەرشتي‌یان ئەکا .

**مەبدەئی حەوتەم :**

یاساخ کردنی ئیسراف‌و پارە بە فیڕۆدان‌و زۆر ڕۆ چون لە ڕابواردنا ، ئیسلام بۆ هەموو شتێ سنووری گونجاوی داناوەو ڕێ نادا

بەلی دەرچونیان « وكلوا واشربوا ولا تسرفوا ١ ». یاني بخونو بخونەوە وئیسراف مەكەنو لە سنوور دەرمەچن .

**مەبدەئی هەشتەم :**

مەبدەئی حەرام و قەدەغەكردنی مال شاردنەوە و خەزنەدانان :

« والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم ٢»: یاني ئەوانەي زێڕو زیو ئەشارنەوەو خەزنەیان ئەكەن وەلە ڕێی خوادا سەرفیان ناكەن مژدەیان بدەرێ بەسزای بەهێزو نارەحەت .

**مەبدەئی نویەم :**

مەبدەئی « ئەمەت لەكوێ بوو ؟ » : ئیسلام سەرەرای ئەوەي ڕێگا ئەدا بەمرۆف ئیش بكاو سامان دەست خۆی بخاو موڵكایەتي تەنیایی و تایبەتی داني پیائەنێ لەگەل ئەمەدا ڕێگاو سنووری بۆ داناوە وەئەبێ بەپێی ئەو ڕێگایانە و لە شورای ئەو سنورانەدا خەریك بێ ، وەئەگەر سامان لای یەكێ یا چەند كەسێ زور بوو كە لەكەی كرد دەولەت بوی هەیە داوای [ لە كوێت بوی ] لێ بكاو بە پێی مەبادیئەكانی ئیسلام دەستي تێ بخا ئەگەر بە ڕێی ڕاست كوێ

١) الاعراف ٣١ ٢) التوبة ٣٤

کردبووەوە . بەلام ئەگەر لە پێك هینانیا لە مەبادیئەکان لای دابوو لە سنوور دەرچوبوو ، بۆ نموونە ئەگەر بە داگیر کردن یا زولم و زۆر یا دزی یا بەرتیل یا فرو فێڵ یا سوو دەست بە سەرا گرتن یا قومارو یانسیب یا عەرەق و شەراب و ... هتد دەست خۆی خستبوو ، لیرەدا ئیسلام دان بەو ماڵەدا نانێ وبە ماڵی گشتي موسڵمانانی دائەنێ ـ ئەگەر خاوەنەکەي دیاری نەبێ ـ وەئەی بات بۆ [ بيت المال ] وخەزینەی دەوڵەت .

## مەبدەئی دەیەم : زکاتە .

زەکات مەبدەئێکي گەورەی ئابووری‌یە لە ئیسـلاما ، زەکات وەنەبێ بریتي بێ لە خێرو چاکە کردن لە لایەن دەوڵەمەندەکانەوە بۆ هەژارو کەم دەسەکان هەتا سەرمایە دارەکان بە ئارەزوو خواستي خۆیان بیدەن بەوانەی خۆیان ئەیانەوێ بەرابەر بە ئیش و بێکار کردن یامنەتیان بەسەرا بکەن ، یا بو ترێ دەستي ژورو چاکترە لە دەستي خوارو یا وێنەو نیگاریکي ریسـوایي و داماوی هەبێ وەکو دوژمناني ئیسلام ئەڵێن :

نەء وا نیەو بەڵکو هەقێکي ماڵی‌یەو خەرج و بـاجێکی ساڵانەیە کە حوکومەت هەموو ساڵێ بەپێی ریژەیەکی تایبەتی لە دەوڵەمەندەکاني

ئەسێنێ ، وە بەپێی یاسایەکی رێك‌و پێك سەرفي ئەکاو دابەشی ئەکا .
ئایا ئەگەر حوکومەت لە ماڵی دەوڵەمەندەکان خەرجێك بسێنێ بۆ خوێندن و زانیاری کەس ئەڵێ ئەمە ریسوایي‌و سوکی‌یە بۆ شانی مامۆستایان‌و کار بە دەستان ، بێ گومان نەء .
لە پیشەوە زانرا کە زەکات خەرجێکي سالانەیەو حوکومەتی ئیسلام لە ماڵی دەوڵەمەندەکان بە رێژەی ٢/٥٪ هەتا ١٠٪ وەری ئەگرێ هەموو ساڵێك‌و لە شوێنە دیاری کراوەکانا خەرجی ئەکا ، کە واتە نابێ دەوڵەمەندەکان خۆیان وەبە ئارەزوي خۆیان بلاوی بکەنەوە بەڵکو ئەبێ نوێنەری تایبەتی حوکومەتی ئیسلامی وەري بگرێ ، لەمەوە بۆمان دەر ئەکەوێ : یەکەم پێویستي موسلمانان ئەوەیە کە هەوڵ‌و تێ کوشان بڕوچان بدەن بۆ دامەزراندن و پیك هێنانی حوکومەتی ئیسلامی ئەو حوکومەتەي بە پێی مەبادیئەکاني ئیسلام دروست بێ‌و کار بە دەستەکانی ئیسلام بە لایقیان دابنێ ولە سەر یاساو بەرنامەی ئیسلام برواو دروشم ورژێم و نەریتي لە ئیسلامەمەوە هەڵ گوزێ . وەکەمتر خەمی وگوێ نەدانی موسلمانەکان بەم کارە گرنگە ئەبێتە هۆی وەستاندن‌و کار نەهێناني زۆر لە یاساو مەبادیئەکانی ئیسلام ، وە بەمەیش موسلمانان هەموو گوناهبارن‌و خوا پرسیاریان لێ ئەکاو موحاسەبەیان ئەکات .
ئیتر چۆن ئەبێ موسلمانەکان بە تەمابن بەزەکات دانێکي روت‌و

بێ‌تام ڕزگاریان بێ و لێ‌پرسینەوەیان نەبێ .

چارەسەرکردنی هەژاری و لا بردنی کەم و کوڕی بەهۆی زەکاتەوە :

لە پێشەوە زانیمان کە نابێ دەولەمەند خۆی زەکاتەکە دەرکاو ڕاستەو خۆ بیدا بەهەژارەکان بەڵکو نوێنەری تایبەتی حکومەت وەری ئەگرێ و دوایی دابەش ئەکرێ بەسەر هەژارو کەم دەستانا.

وەئێستاش نە کۆمەڵ بە یاسای ئیسلامەتی ئەجوڵێتەوە و نە حوکومەت ئیسلامی‌یە، ئەگەر بێت و تەنیا لە بەندی زەکاتا بەپێی بەرنامەی ئیسلام بجوولێنەوە ئەتوانین تەنها بە زەکات لە ماوەیەکي کەما زاڵ ببین بەسەر هەژاری و کەم دەستی‌یاو کەم و کوڕری لە وڵاتا نەیەڵین . چونکە ئیسلام ڕازي نابێ لە هەژارەکان بە تەمەڵی و بێ‌کاری دابنیشن و زەکاتیان بۆ کۆبکرێتەوە و بکرێ بە قورگیانا ، بەڵکو لە پێشەوە هەڵمەت ئەباتە سەر بێ‌کارو تەمەڵەکان ، وەئەیان‌خاتە ئیشەوەو نایەڵێ هەرکەسێ ئیشی لێ‌بێ - هەرئیشی‌بێ - بەبێ ئیشي دابنیشێ و کارێکی بۆ ڕێك‌خات ، وەلە ماڵی زەکات داوای کۆکردنەوەی سەیر ئەکا ئەوەی ئیشی‌نیە و ئەتوانێ ئیش‌بکا هۆیەکانی بۆپێك دێنێ ، بۆ جوتیاری بێ‌ئیش و زەوی و تۆو و شتەکانی‌تر ڕێك ئەخا ، بۆ دارتاش تەشوێ و مشارو ئامێرەکانی‌تر پێك دێنێ و ... هتد . بێ‌گومان ئەمانە بۆ

ساڵی دوایی ئەگەر زەکاتیان لێوەر نەگرێ پێویستیان بە زەکات پێدان نامێنێ ، بەم پێیە بەگوێرەی ئیسلام بگەڕێین بەناو کومەلا بە دڵسوزي بەچەند ســـاڵێك ئەتوانین هەمووی بخەینە ئیشەوە و بەرو بوومی لێ وەرگرین و سوودمان پێبگەیەنێ .

ماوەتەوە پیرو کوێر و نوقسان و پەك کەوتو و ئیش لێ نەهاتو ، ئەمانە موچەی تایبەتی و دیاریان بۆ ئەبرێتەوە کە پێی بژین .

وەچی لە ماڵی زەکات مایەوە لە پێویستیەکانی کۆمـەلا : وەکو مزگەوت و پرد و شـەقام و قوتابخانە و نەخۆشـخانەو ... هتد . وەلە پرۆژەی بە سوودا کە سـوودي بگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵ وەکو پرۆژە و کانگاو کارگاو ... هتد بەکار ئەهێنرێ و ئەخرێتە ئیشەوە و بەماوەیەکی کەم وولاتەکەمان لەپێشەنگی کاروانی شارستانیەتی‌یەوە ئەبێ .

ئەمەیش وەنەبێ تەنها شتێکی نەزەری یا خەیاڵ و خەوبینینێك بێ ، بەڵکو شتێکی ڕاست و واقیعی‌یەو چەندەها ساڵ موسڵمانەکان لە سەری ڕۆیشتون و بەکاریان هێناوە ، وەکو مێژو بۆمان ئەگێڕێتەوە بۆ نمونە :

یەحیای کوڕی سەعید ( یحیی سـعید ) ئەڵێ : « عمری کوڕي عبدالعزیز ناردمی بۆ خەرج و زەکاتی ئەفەریقـاو هێنامەوە گەڕاین بەشوێنی هەژارانا بیان دەینێ کەسمان دەست نەکەوت و ئەچوینە ماڵی هەرکەس ئەی ووت لەوپێش بوایە وەرمان ئەگرت بەلام ئێستا نامانەوێ

عمری کوڕی عبدالعزیز هەمووی تێر کردوین . لە پاشا عمر فەرمووی: « بزانە بەندەی پێ بکڕەو ئازادیان بکە » .

ئەم نموونەو چەندەهای وێنەی دەری ئەخا کەئێمەی موسڵمانان بەدرێژایی مێژوومان دواکەوتنو ڕیسوایی‌و بەجێمان و کەم‌و کوڕی‌و هەژاریمان بەگوێرەی پشت‌کردنمان بووە لە ئایین‌و لادانمان بووە لە مەبادیئەکانی وە هەرکاتێ چووبینەتەوە سەر ڕێگای ڕاستی ئایینەکەمان لە پێشەنگی کاروانی مرۆڤایەتی‌یەوەو جێگای مامۆستاییمان بووە .

دووبارە ئەی‌خەمەوە پێش چاو کە هەوڵ دانمان بۆ بە جێ‌هێنانی مەبادیئەکانی ئیسلام‌و بۆ بەکارهێنانی یاساو نەریتەکانی‌و بۆ دامەزراندنی حوکومەتێکی ئیسلامی پێویستی‌یەکی ئایینی‌و کۆمەلایەتی‌و ئابووریمانە ، وە نەبوونی ئەمانەیە هۆی دواکەوتن و داماوی‌و کۆیلەیی‌و نەخۆشینە کۆمەلایەتی‌یەکانمان .

بەلام (داخی گرانم) ئێمە لەم حەقیقەتە بێ ئاگاو کەمتەرخەمین‌و بە هیچ جۆرێ بیری لێ‌ناکەینەوەو ئەلێی مێشێ میوانمان نیە .

****

## پایەی چوارەم لە ئیسلاما :

# ڕۆژو گرتنــــە

کاتێ خوای پەروەدگـار پێغەمەری مەزن «محمد» (دروودی لەسەربێ) نارد بۆ ڕزگارکردنی گرۆهی ئادەمیزاد لەو هەموو نارێکیو خراپەو سەرلێتێك چونو گومراهی‌یەی تیا ئەژیان ، وە بەرزترین ئایینو بەرنامەی پیا نارد تامرۆڤەکان واز لەو بەرنامەو پرۆگرامە پرو-پوچانەی سەرزەوی بێنن و بێنە سەر بەرنامەی ڕاستەقینەو پڕ ســـودی خوا بەکۆمەڵی و بەبرایەتی و یەکێتی‌یەوە «واعتصموا بحبل الله جمیعاً ولا تفرقوا[1]» یانی هەمووتان بێنە سەر ئایینی خوا (ئایینی ئیسلام) وەدەستی پێبگرن و بلاوەمەکەن و جیا مەبنەوە .

سروشتی‌یە هەندێ باوەڕ بەو پێغەمەرە ئایینە بکەنو بێنە سەر بەرنامەکەی و ئەوانی تریان بەربەرەکانی بکەن و بکەونە بەرگری کردن لە بەرنامەی نەفامیی و پشت گیری لێبکەن و بینە کوسپ و گرێ لەڕێی

---

[1]) العمران ١٠٣ .

بلاو بوونەوەی ئاینا بەناو کۆمەڵی ئادەمیزادا .

خوا خوایش ئیسلامی ناردووە بۆ ئەوەی بلاو بکرێتـــەوە بە سەرزەوی‌یا بێ بە بەرنامەی تەواوی جیهان هەتاهەتایە ، بۆ پێك‌هێنانی ئەم مەبەستە خوای‌گەورە داوای کرد لە پێغەمەر و موسـولمانەکان کە بینە بانگ‌کەر بۆی و بلاوی بکەنەوە بەناو مرۆڤەکانا وەخەلکی‌بانگ بکەن بۆ سەری .

« ولتكن منكم امة يدعون الى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر واولئك هم المفلحون ١ » : یانی ئەبێ‌کۆمەڵ لەئێوە تەرخان بێ وەبانگی مرۆڤەکان بکەن بۆ سەر خێرو چاکە و فەرمان بدەن بە چاکەکردن و قەدەغە و بەرهەڵستی بکەن لە خراپەکاری ، وەهەر ئەمانە رزگارو سەرفرازن .

وەداوای لێ‌کردن کە موسڵمانان هەموویان لە ناو خۆیانا یەك بن و موسڵمان بە هیچ کلۆجێ پەیوەندیو وابەستەیی‌نیە بە ناموسڵمانەوە باخزم و کەس و کاریش بێ

« لا تجد قوماً يؤمنون بالله واليوم الآخر يوادون من حاد الله ورسوله ولو كانوا آباءهم أو إخوانهم أو عشيرتهم ٢ » : یـانی نابینی

١) العمران ١٠٤ ٢) المجادلة ٢٢

کومـــەڵێك باوەڕیان هینابێ بە خواو بە ڕۆژي دوایی لەگەڵ ئەوەشا دۆستـایەتی و پەیوەندی‌یان بێ لەگەڵ ئەوانەی دوژمنایەتی و جەنگ ئەکەن لەگەڵ خواو پێغەمەریـا ، با ئەوانە باوو باپیر یا کورو نەوەو وەچە یا برا یا خزم و کەس و کاریان بن .

وەتێ‌گەیاندن کە کومەڵی خوا یەکەو نابێ بەدوو ، وەکومـەڵە کانی‌تر گومراهن وەشوێن‌کەوتوی شەیتانن .

« الذین آمنوا یقاتلون في سبیل الله والذین كفروا یقاتلون في سبیل الطـاغوت فقاتلوا اولیاء الشیطان إن كیـد الشیطان كان ضعیفاً ١ » : یاني موسڵمانەکان ئەجەنگن لە ڕێی خوادا وەکافرەکان جەنگ ئەکەن لە ڕێی طاغوتا ، جەنگ بـکەن لەگەڵ دۆست و کۆمەڵەکانی شەیتانا و بیان‌کوژن خۆ فروفێڵی شەیتان پروپوچە .

وەیەك ڕێگا هەیە بۆلای خوا بچێ و مرۆف بگەیەنێ بەخوا ، وەڕێگاکانی‌تر لە خوا دوری ئەخەنەوە .

« وأن هذا صراطی مستقیما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن ســـبیله ٢ » : یاني ئەمەیە ـ واتە ئاییني ئیسلام ـ ە ڕێگای ڕاستی من ئێوە بکەونەسەری و نەچنە سەر ڕێگاکاني‌تر چونکە لەڕێی خوای خۆتان ئەتان ترازێنێ و بلاوەتان پێ ئەکا .

---

١) النساء ٧٦ ٢) الانعام ١٥٣

وەیەك حوكم و فەرمان ڕەوایی و یاسا هـــەیە کەهینی خوا و ئیسلامي بێ و ئەوانیتر هەموویان یاسای نەفامین

أفحكم الجاهـــلية يبغون ومن أحسن من الله حـكماً لقوم يوقنون ١ » یاني ئایا ئەوانە ملە جەڕە ئەکەن لە فەرماني خوا و حوکم و یاساي نەفامێتییان ئەوێ ؟ ئەبێ فەرمان ڕەوایي و یاساي کێ لە هیني خوا جوانتر بێ بۆ ئەوانەي باوەڕیان هەیە ؟

وەیەك شەریعەت هەیە کەهیني خوابێ و ئەوانیتر هەموو هەواو ئارەزوکارین

[ ثم جعلناك على شريعة من الأمر فاتبعها ولا تتبع أهواء الذين لا يعلمون ٢ ] یاني تۆمان خستوەتە سەر شەریعەتو بەرنامەی کار و بار شوێني بکەوەو شوێن هەواو ئارەزوی نەزانەکان مەکەوە یەك حەقیقەتو ڕاستی هەیەو بێجگەلەوە هەموو گومڕاییو سەر لێ شێوانن .

[ فماذا بعد الحق إلا الضلال ٣ ] یاني ئایا لە دوای حەقیقەت وراستي بێجگەلە سەر شێوانو گومڕایي چيتر هەیە

وەحوکمو فەرمان ڕەواییو کار بە دەستي هەر بۆ خوایەو بەس « إن الحكم إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ولكن اكثر الناس لا يعلمون ٤ » وەئاینزو بەرنامە ئەبێ هەر هي حو بێو بەس

---

١) المائدة ٥٠ ٢) الجاثيه ١٨ ٣) يونس٣٢ ٤) يوسف٤٠

وەئەبێ گەردن کەچی هەر بو ئەو بکرێ [ وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين كله لله ١ ] یاني بچن بەگژ ئەو کافرانەدا کە بەرگري لە نەفامێتی ئەکەن‌و ئەیانەوێ بینە کۆسپ لە ڕێی بلاو بونەوەی مەشخەڵی ئازادی ئیسلامي‌یا بۆ ئەوەی خراپکاری نەمێنێ‌و بەرنامەی خوا بێتە باوی تەواوی سەر زەوی‌و بە تەنیا گەردن کەچي هەر بۆ خوای گەورە بکرێ . بەم پێیە ئایینی ئیسلام ڕاستي‌یەکانی ڕۆشن کردەوەو ئامۆژگاری تەواوی نارد بۆ موسڵمانەکان‌و داوای لێ کردن کە هەڵسن بەم کارە گەورەیەو ئەبێ ئەم مەشخەڵی ئازادی کەرە هەڵ بکرێن‌و جیهانی پێ ڕزگار بکەن‌و تەواوی سەر زەوی بە چراي ڕوناکي ئیسلام ڕۆشن بکەنەوە ، وەهەر پۆش‌و پەلاشێ هاتە ڕێیان ئەبێ پاکی بکەنەوە وەهەر گەژو چیایەك بەري لێ‌گرتن ئەبێ بی‌ڕوخێنن‌و لە ڕیشە دەري بێنن با زۆریشی تێ‌بچێ .

بێ‌گومان ئیشي وەها پڕ لە مەترسي‌یەو چەندەها جەنگ‌و هەرای تیا بەرپا ئەبێ چونکە نەفامەکان بە ناچاری بەرگری لە نەفامێتي‌یە‌یەکەیان ئەکەن بە تایبەتی زاڵم‌و خوێن مژو گێرە شێوێنەکان‌و بە کرێ گیراوەکانیان ، وەکاری ئاوەها مرۆڤي نەبەزو چالاك‌و بلیمەتی ئەوێ کە بتوانێ ئاوی تاڵ‌و سوێر بخواتەوە بەرگەی سەرماو گەرما بگرێ‌و

---

١) الانفال ٣٩

هەموو کاتێ ئامـادەیی بێ وەلە سـەر خوی‌و ئارام کالآی بالآی بێ‌و گوێ بە بوون‌و نەبوون‌و برسیەتی‌و تینویەتی نەداو لە بەر زەحمەت‌و نارەحەتی‌و چەوسانەوەو ناسۆرا خۆی پێ ڕابگیرێ

[ یا بني أقم الصلاة وامر بالمعروف وانه عن المنكر واصبر على ما اصابك إن ذلك من عزم الامور ٥ ] یانی خوا لە زوبانی لوقمانەوە ئەگێڕێتەوە کە ئامۆژگاری کوڕرەکەی کردوە ئەی کوڕری خۆم نوێژ بکەو فەرمان بدە بە چـاکە کردن‌و بەرهەڵـستي بکە لە خراپکاری و ئارامت بێ چونکە ئەمە لەو ئیشە گەورانەیە کە پێویستي‌یان بە ئارامي زۆر هەیە لە بەر ئەمە ئیـسلام ئەبێ مرۆڤ‌و سەربازی بە کارو لێهاتو دروست بکاو ئامادەیـان بکا بۆ هەڵگرتنی ئەو پەیامە پیرۆزە وەئەبێ لە پەرستنەکانەوە دەست پێ بکا بەم پەروەردە کردنە

ئەوەیە لە نوێژا چەندەها وەرزش‌و سەرماو گەرماو ئامادە کردن هەیەوە لە زەکاتا دەست لە دڵ نان‌و بەخشش‌و دڵ گوشادی تیا پەیدا ئەبێ وە ڕۆژویش باشترین تاقي کردنەوەو خۆ ڕاهینانە لە سـەر نارەحەتی وەئـارام گرتنە لە سەر برسێتي‌و تینوێتي‌و سەرماو گەرماو ئیش‌و ئازار ، وەبریتي‌یە لە ئامادە کردن‌و پێگەیاندن‌و ڕاهێنانی لەش. وەڕوون پیغەمەر [ دروودی لە سەربێ ] فەرموویە

---

١) لقمان ١٧

[ بۆ هەمـوو شتێ زەکات هەیە ، زەکاتی لەش ڕۆژو گرتنە ] وەفەرموویە [ ڕۆژو نیوەی ئارامە ، وئارام گرتن نیوەی باوەڕە ] .

فەرموودەی یەکەم وائەگەیەنێ کە مەبەست لە ڕۆژوودا زیـاتر بریتی‌یە لە سەبرو ئارام‌گرتن ، وە بە دوو فەرموودەی دوایی دەر ئـەکەوێ کە ڕوژوو ٤/١ چواریەکی باوەڕو ئیـسلامە واتە بە ڕۆژوو گرتن پایەیەکی گرنگ لە ئیسلامەتیا بەرز ئەبێتەوە :

کە پێ‌گەیاندنی مرۆڤی چالاك‌و بلیمەت‌و دلێرە بۆ بەرز کردنەوەی ئالای بەریزی ئیـسلام‌و بۆ بلاوکردنەوەو گەیاندنی پەیـام‌و بەرنامەی ئیـسلام بە سەر زەوی‌دا . ڕۆژو بریتی‌یە لە ئارام‌و خۆگرتن لە سپیدەی بەیانی‌یەوە هەتا ئێوارەو شەو دێت لەسەر برسێتی‌و تینوێتی‌و لە بەرابەری ئارەزوو ، وە بەربەرەکانی کردنە لەگەڵ نەفس‌و دەروونا لەسەر ئەو شتانەی داواو داخوازیان ئەکا ، وە خۆ فێرکردنە بەبرسـێتی‌و تینوێتی‌و بە دوورکەوتنەوە لە ژن‌و خێزان‌و لەو شتانەی تر کە ئارەزوویان بکات، وە خۆ فێرکردنە بە شەو کردنەوەو شەبەیخون‌و سەرماو گەرماو بێ‌تاقەت بون ، هەر وەکو فێرکردنی سەربازو ڕاهێنانی لە سەر ئەو شتانەی لە کاتی جەنگ‌و تەنگانەدا بەکار دێن‌و پێویستی‌یان تێ‌ی‌ئەکەوێ .

لەمەی پێشـەوە دەرکەوت کە ڕۆژوو هۆیەکی گەورەیـە بۆ پەروەردەکردن‌و ئامادە کردنی مرۆڤ ئەو مرۆڤانەی بتوانن مەشخەڵ

ئازادی کەری ئیسلام هەلبگرنو مروفایەتی پیرزگار بکەن وە لەو ریگایەدا بتوانن بەرگەی هەموو جورە بەسەر هاتێ بگرنو بتوانن بە سەر کوسپو گرێکانا زالّ بن ، ئیتر ئەبێ چون واسەیری رۆژو بکەین کە بەشێکی جیاوازە لە بەشەکانی تری ئیسلام یا ئەتوانرێ بەتەنیاو بەرووتی بەجیبهینری ؟!.

قورئانی پیروز ئەفەرمووی : « یا أیها الذین آمنوا کتب علیکم الصیام کما کتب علی الذین من قبلکم لعلکم تتقون ۱ » یانی ئەی موسلّمانو خاوەن باوەرەکان پێویست کراوە لە سەرتان رۆژوو گرتن هەروەکو پێویست کراوە لەسەر ئومەتەکانی پیش ئیوەوە بو ئەوەی خوتان بپاریزن لەرقو خەشمی خوا .

سەیری کە ئەفەرمووێ : بو ئەوە روژوتان لە سەر دانراوە تابە هویەوە خوتان برابێن لەسەر ئەو شتانەی لەرقو خەشمو قینی خوا ئەتان پاریزن ، واتە رۆژو پالّ پیوەنەرە بو چونە مەیدانی تێکوشانەوە بەکردنی داوا کراوەکانو بەخولادان لە قەدەغەکراوەکان و بەمەیش خوا لیتان رازی ئەبێ .

وە هەروەها رۆژو دەرسێکە بو یەکسانیو بو بەیەکا بوونی موسلّمانەکان : بەهەژارو دەولەمەندو ژوور دەستو ژیر دەستوگەورە

---

۱) البقرة ۱۸۳

و بچوك‌و نێرو مێ‌و دوورو نزیکیانەوە لە برسێتی‌و تینوێتی‌و بێ‌تاقەتی‌یا، هەتا هەموویان هەست بکەن بەکسانی‌و یەکیەتی وە لەگەڵ ئەمەیشا دەوڵەمەندو خاوەن دەستەلاتەکان لە ئێش‌و ئازاری نەبونی‌و برسێتی تێ‌بگەن‌و لەمەیشەوە هەستی هاری‌و بەخشندەیی‌و یارمەتی‌و بەزەیی تیایانا بجولێ‌و دەست‌گیرۆیی نەبووکەی دەسەکان بکەن‌و پێکەوە بژین.

ڕۆژوو خواپەرستیەکی ناوازەیەو دوورترین شتە لە روپامایی‌و ورپاکردن، وە چەندەها سوودی گیانی‌و دەروونی تیایە، ڕۆژو (بەپیچەوانەی پەرستنەکانی ترەوە) تەنیا خوا یەبێ کەس ناتوانێ بەنهێنی‌یەکانی بزانێ، وە پەنامەکی‌یەکی ئەوتۆیە خوانەبێ کەس چاودێری وەئاگاداری بۆ ناکرێ.

لەبەر ئەمە خوای گەورە پاداشی تایبەتی بۆ داناوە کەهەر خوی ئەی‌زانێ، پێغەمەری خوا (دروودی لەسەربێ) ئەفەرمووێ: «خوا فەرمویە: هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی تەنیا ڕۆژو نەبێ، بۆمنەو من خۆم پاداشتی لەسەر ئەدەمەوە، ڕۆژو پارێزەرە، ئەگەر بەڕۆژو بوون نەچنەلای خێزانتان، وەهەراو قرە مەکەن، ئەگەر هاتن بەگژتاو جنێویان دایێ بلێ: من بەڕۆژوم».

مرۆڤی بەڕۆژو لە پەرستن‌و بەندەیی‌و گوێ‌رایەڵی خوا دایە لەبەر ئەوە نابێ کارێکی وابکات کەپێچەوانەی خواپەرستی بێ‌و تیایا

وله سنوور دەربچێ ، وەئەبێ خۆی برازێنێتەوە بەو شتانەی لە گەڵ
خوا پەرستی‌یەکەیا ئەگونجێن وەکولەسەرخۆیی‌و شەرم‌و ئەدەب‌و چاوپۆشی
وگوێ ڕایەڵی‌و گەردن کەچی‌و بەندایەتی‌و پەشیمان بوونەوە لە خراپکاری
ونەفامی‌و گەڕانەوە بۆ لای فەرمانەکانی خواو داوای لێ بوردن‌و لێ خۆش
بون لێ کردنی ، یا وەکو هاندانی خەڵکی‌و پاڵ پێوە نانیان بۆ چاکە
کردن‌و گێڕانەوەیان لە خراپەو تاوان ، وەکو یارمەتی‌دانی موسڵمانان
وبەزەیی‌و ... هتد . لەو کارە چاکانەی کومەڵایەتی کومەڵ پتەو ئەکەن
وبەلای خواوە خۆشن . وەئەبێ خۆی لابدا لەو شتانەی پێچەوانەی
پەرستن‌و گوێ ڕایەڵێن‌و خوای گەورە نارازی‌یە کە بکرێن‌و زیان بە
کۆمەڵایەتی کۆمەڵ ئەگەیەنن ، خۆ ئایینی ئیسلام ـ بە هەموو
بەشەکانی‌یەوە ـ یەك « وحدە » یەو ناکرێ بەشەکانی جیا بکرێنەوە
وپەرتەوازە ناکرێن « أفتؤمنون ببعض الكتاب وتكفرون ببعض فما
جزاء من يفعل ذلك منكم الا خزي في الحياة الدنيا ويوم القيامة
يردون الى أشد العذاب ١ » یانی ئایا ئەتانەوێ باوەڕ بکەن بە
هەندێ لە کتێب و پەڕاوی خوا « واتە گوێی ڕایەڵی بکەن‌و شوێنی
بکەون » وەباوەڕتان نەبێ بە هەندێ تری « یانی پێی هەڵ نەسن‌و

---

١) البقرة ٨٥

گوێ رایەڵ‌و پەیرەوی نەکەن » ؟ هەر کەسێ لە ئێوە وابکا سزای بریتی‌یە لە ژێر دەســـتەیی‌و ڕیسوایی لە جیهاناو لە ڕۆژی دوایی‌دا ئەخریتە خراپترین ئەشکەنجەو ئازارەوە . وەپێغەمەر « دروودی لە سەربێ » فەرموویە « زۆر روژووەوان هەیە بێجگەلە برسیەتی پاداشتێکی نیە ، وەزوز کەس هەیە شەو نوێژ ئەکەن بێجگەلە بێ خەوی‌و ماندویەتی پاداشتیان نیە » وەفەرمەوویە « ئەو روژووەوانانەی واز لە ووتەی خراپ‌و کردەوەی نارەوا نایەنن خوا هیچ پێویستیەکی نیە بەواز هێنانیان لە خواردن‌و خواردنەوە » .

قازی بەیزاوی [ بیضاوی ] خوا لێی خوش‌بێ لیرەدا ئەڵێ : « مەبەست لە پێویست کردنی ڕۆژو برسیەتی‌و تینوێتی نیە بەلکو مەبەست پێی ئەو مانایانەیە لە مانەوە پەیدا ئەبێ وەکو شکاندنی ئارەزوو زال بوون بە سەر نەفسی خراپکاراو راهێنانی لە سەر کردەوەی چاکە. وەرهەکاتێ ئەمـانە لە ڕۆژودا پەیدا نەبوون مانای وایە خوای گەورە ڕۆژووەکەی وەر نەگرتووە » .

## ڕۆژو لە ترازوي زانیاري‌دا «١»

زانای بە ڕێز ماموستا ( سید محمد رشید رضا ) خوا لێی خوش‌بێ

---

١) سەیری « الصیام في الاسلام » ی محمد محمود صواف بکە .

له تەفسیری مەناردا له بەرگي یەکەم لاپەرە « ١٤٨ » دا ئەلی: ( له سوودە تەندروستیەکانی رۆژووەوە : ئەو ماددانە لا ئەبا کە وابوون بە خلتەو له لاشەدا پەیرەبون ، بە تایبەتی لە لاشەی ئەوانەی دەوڵەمەندن وەهەر نەخۆن و ئەخۆنەوەو ئەخەون و خۆیان له ئیش و کارانا رەنجێنن وەتەڕاییە « رطوبة » زیان گەیەنەرەکان سوك ئەکا ، وریخۆڵەو ناوسك پاك ئەکاتەوە له خراپەی ئەو ژەنك و ژەهرانەی بە هۆی قەڵەوی و ورگ زلیەوە پەیدا ئەبێ وەپیوە بەزەکان ئەتوێنێتەوە ، یان نایەڵێ له ناو سکا پەرە بسێنن کە شتێکی سامناك و خاوەن زیانی گەورەیە بو دڵ .
وە رۆژو گرتن هەر وەکو غارکردن و گیرانی وولاغی سواریە کە هێزی پەلاساردان و هەڵمەت و گەڕانەوەی تیا زیاد ئەکا .

پیغەمەر « درودی له سەربێ » فەرمویە ( رۆژو بگرن لەشتان ساغ ئەبێ ) وەفەرمویە « بە غەزا کردن تالان و قازانجتان دەست گیر ئەبێ ، وەبەرۆژو گرتن تەندروست ئەبن ، وەبە سەفەر کردن سوودتان دەست ئەکەوێ » .

هەندێ له پزیشك « دکتور » وزانا ئەفەرنجیەکانا ئەلێن :
« رۆژوي مانگێك له ساڵا ئەو هەموو گۆشت و پارچە مردوانە له لەشا لا ئەبا کە له ماوەی ساڵەکەدا تیا کۆبوەتەوە » وەسوودە تەندروستیەکانی رۆژو رۆشن و دیاریە لای ناموسڵمانەکانیش له

ئەوروپایی ئەمەریکایی‌یەکان وەزۆر کتیبیان لەم بارەوە داناوە . وەچەندەها نەخۆشخانەیان دروست کردووە کە چارەی نەخۆشەکانی بە ڕوژو گرتن‌و زۆر نەخۆشیان بەم چارەیە لە نەخۆشی گران‌و یاخی ڕزگار بووە کە بە هیچ شتێکی‌تر چارەیان نەکراوە .

بە ناوبانگترینی ئەو زانایانە زانای ئەمەریکی « ماك فادن » ە کە یەکێکە لە زانا گەورەکانی تەندروستی ، نەخۆشخانەیەکی گەورەی لە ئەمەریکادا دروست کردووەو بە ناوی خویەوە ناوی ناوە ، وەکتێبێکی لە بارەی ڕۆژووەوە داناوە .

ماك فادن ( Mak Fadin ) - وەکو زۆر زانای‌تر - ئەلێ: ڕۆژو زۆر کەلکی گەورەی هەیە بۆ لەش‌و پاکی ئەکاتەوە لەوژنگ‌و ژارو خڵتەو ملتانەی لە خۆراك و دەرمانەوە لە لەشدا ماونەتەوە » وەئەلێ « بە ڕوژو پێ‌گرتن چارەی زۆر نەخۆشم کردووە ، وەکەڵك وەرگرتنی نەخۆشەکان لە ڕوژو بەگوێرەی نەخۆشیەکان جیاوازی هەیە وئەو نەخۆشی‌یانەی زیاتر بە ڕوژو چاك ئەبن‌و لە ناو ئەچن :

نەخۆشیی گەدە « معدە » کە چارەی بە ڕۆژو وەکو سیحر وایە وباشترین چارەیە ، پاش ئەو نەخۆشی‌ی خوێن ونەخوشی ڕەگ ودەمارو باداری [ ڕوماتیزم ] وەناوی ئەو نەخۆشانەی بە ڕۆژو چاك لە گەڵ نەخۆشی‌یەکەیان وکات وبە رواری چاك بونەکەیانی نووسیوە .

وە ( ماك فادن ) لە کتیبەکەیا ئەلی : « هەمووکەسی بانەخۆشیش نەبی پیویستی هەیە بە رۆژووگرتن » وەبە دریژی لە سوودی رۆژوو ئەدوی و ئەی‌کات بە پیویستی‌یەکی تەندروستی بو هەموو مروفی و بۆ هەموو لەشیك .

گەورەیی‌و بێگەردی هەر بو خوایە کە ئایەت‌و نیشانەو فەرموودەکانی زۆژ بەروژ روشنتر ئەبنەوەو دەرئەکەون هەتا بۆ ئەوانیش کەدان بەبوونی خوادا نانین « سنریهم آیاتنا في الآفاق وفي انفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق١ » یانی وردە وردە ئایەت‌و نیشانەکانی خۆمیان پیشان ئەدەم لە گێتی‌و لە دەروونی خۆیاندا هەتا بۆیان دەربکەوێ کە خوا هەق‌و راست‌و ئاینەکەی راستەقینەیە . زۆر لە وانەی کە موسلمان نین‌و بگرە باوەریان بە خواو بەهیچ ئاینێ نیە ئیستا ناچار بوون کە باوەش بکەن بە ئەحکام‌و فەرمان‌و مەبادیئەکانی ئیسلاما ، وە دان بنێن بە سوودو کەلکی گەورەیانا بو کۆمەل : ئەمەریکا شەراب‌و عەرەق خواردنەوەی قەدەغەو یاساخ کرد زۆرو زەبەندە لە گەلیا خەریك بوو ، وە تەلاق دانی کرد بەباو لەگەل ئەوەدا کە ( بەناو ) دەولەتیکی مەسیحی‌یە .

وە روسیا کە دەولەتیکی بێ ئاینی‌یە خوێندنی تیکلاوی کورو

---

١) فصلت ٥٣

کچ قەدەغە ئەکاو قوتابخانەیان بۆ جیا ئەکاتەوەو ئەڵێ : خراپەی زۆر لە تیکلاوی دا ڕو ئەداو پیاو خۆی ژنو ژن خوی پیاو ئەگری .

وە هیندستان کە دەولەتیکی بت پەرســـتە عەرەق خواردنەوە یاساخ ئەکا وە سەرۆك وەزیرانی لەم ڕووەوە ئەلی : «مەرحەبا لەکاتی (خواردنەوە قەدەغە کردن ) وە لەکاتی ڕزگاربوونی عەقلو هۆشو ژیری . وە ئەوروپایی یەکانو ئەمەریکایی یەکان چارەی دەردو نەخۆشی بەرۆژووگرتن نوکەنو ئاموژگاری گشتی پی ئەکەن»

بەلام بەداخەوە ـ لە دەولەتە ـ بەناو ـ ئیسلامی یەکانا بەهیچ کلۆجی دەنگو باسی مەبادی،و ئەحکامەکانی ئیسلام نیە مەگەر بۆ شەو چەرە لە ئاهەنگەکانا ناوی ئیسلامو قورئانی پیرۆز ببری وە بەدەگمەن دەست ئەکەوی کاربەدەستو فەرمانبەرەکان ڕۆژوو بگرن یا بەباشی بزانن بۆ خویشیان .

## بۆچی ڕۆژوو ئەگرین ؟ :

شتیکی تر ماوە پیویستە باسی بکەین : بەلی راستە ڕوژوو ئەو هەموو سوودانە وە زۆر لەوانەیش زیاتر سوودو کەلکی تەندروستی هەیە ، بەلام ئیمەی موسلمان نابی لەبەر ئەو سوودانەی زانیاری تازە دەری خستوون ڕوژوو بگرین ، بەلکو ئەبی تەنها لەبەر ئەوە بەرۆژوو

بین کە خوای گەورە پێویستی گێڕاوە لەسەرمان وە هەتا ئەگەر تووشی نەخۆشیشمان بکا یا هەر خۆی نەخۆشی بێ ڕۆژوو بگرین مەگەر بکەوینە بەر ڕوخسەت « رخصة » بەشێوەیەك نایین پەسندی بکا ئەوسا بیشکێنین‌و دوایی بگیرینەوە ، وە ئەگەر لەبەر ئەو سوودانە ڕۆژووبگرین خوا لێمان وەرناگرێ‌و پاداشمان نابێ بەڵکو گوناهمان ئەگات .

پێغەمەری خوا « دروودی لەسەر بێ » ئەی فەرموو : « هەموو کردەوەیەك بەپێی نیازی ( نیەتی ) ئیش‌کەرەکە وەر ئەگیرێ » واتە ئەگەر بۆ ڕەزای خوا بوو پاداشی چاکەی ئەبێ ئەگینا هەرماندوو ئەبێ وەڵێ وەرناگیرێ ئەگەر گوناهبار نەبێ پێی وە زۆر جاریش گیرۆدە ئەبێ پێیەوە .

## سزای ڕۆژوو نەگر :

ڕۆژوو پێویستی‌یەکی گرنگی ئیسلامەو خوا داوای گرتنی کردووە لە موسڵمانان وە ئیسلام زۆر لە دژی ئەوانە ئەدوێ کە ڕۆژوناگرن‌و سزای زۆر سەختیان بۆ دائەنێ وەلێرەدا بە فەرموودەیەکی پێغەمەر « دروودی لەسەربێ » واز دێنم چونکە بەسە بۆ تێگەیشتوان :

« أبو امامەی باهلی » خوای لێی ڕازی بێ ئەفەرموێ : « بیستم لە پێغەمەر ( دروودی لەســەربێ ) ئەی فەرموو : « کاتێ خەوتبووم

دووکەس هاتن‌و هەردوو قولیان گرتم‌و بەرزیان کردمەوە بۆ ســـەر لوتکەی شاخێك ، لەوێدا دەنگ‌و هەرایەکی ناخۆشم بیست ، پرسیم: ئەوە چی‌یە ؟ ووتیان ئەوە هاواری ئەوانەیە لەناو ئاگران‌و سـزا ئەدرێن . پاشان رویشتین تاگەیشتینە لای کۆمەڵێك هەڵواسرابوون بەرەگی قولاپەیان سـەربەرەو ژێرو لالەغاوەیان هەڵدرابوو خوێنی پیـا ئەهاتە خوارەوە ؛ ووتم : ئەمانەکێن ؟ ووتیان ئەمانە ئەو کەسانەن لە رەمەزانا رۆژوو ناگرن‌و بەرۆژوو نابن » .

****

## پایەی پێنجەم لەئیسلاما :

# حەج کردنە

ئاینی ئیسلام ئاینێکی کۆمەڵایەتی‌یەو هەوڵ و کۆششی زۆری داوە بۆ ئەوەی کۆمەڵایەتی‌و یەکێتی‌و بەیەکا بوون‌و لە یەکتر ئاگا بوون لە ناو دڵ‌و دەروون‌و مێشکی موسڵمانەکانا بچەسپێنێ. هەر لەبەر ئەمەیە دایناوە موسڵمانەکانی دێ یاگەڕەك ڕۆژی پێنج جار لە نوێژی جەماعەتا کۆئەبنەوە ، وە موسڵمانەکانی شارو ناوچە هەموو هەفتەیەك جارێ لە نوێژی جومعەدا کۆئەبنەوە ، وە هەموو ساڵێ لە نوێژی جەژن ڕەمەزان‌و جەژنی قوربانا دوو جار کۆئەبنەوە .

هەر بەم بۆنەیەشەوە پێویستی گێڕاوە لەسەر ئەوانەی توانایان هەیە لە ماوەی تەمەنا کە هیچ نەبێ جارێك بچن بۆ حەج بۆ ئەوەی لەگەڵ موسڵمانەکانی جیهاندا هەموو ساڵی کۆنگرەیەکی گشتی وولاتە ئیسلامی‌یەکان بگرن‌و کۆبونەوەیەکی گشتی جیهانی هەموو ساڵی لەحەجا بکرێت ، هەتا موسڵمانەکان لە یەکێتی تێبگەن‌و تامی کۆمەڵایەتی گشتی بچێژن‌و بزانن کە هەریەکەیان ئەندامێکە لە کۆمەڵێکی گەورەدا

وە خشتێکە لە قەڵای ئیسلامەتی‌یا ، وەهەریەکەیان مەسئول‌و لێ‌پرسراوەیە ( بەگویرەی‌توانای ) لە بەڕێوەبردنی ئەو قەڵاگەورەیەو ئەو ئیسلامەتی‌یەو ئەو کومەڵە .

## سوودەکانی حەج :

قورئانی پیرۆز ئەفەرمووێ : « واذن في الناس بالحج يأتوك رجالاً وعلى كل ضامر يأتين من كل فج عميق ليشهدوا منافع لهم١ » یانی مرۆڤەکان بانگ بکە بۆ حەج کردن دێن بۆ لات بەپیادەیی‌و بەسواری ووشتر دێن لە هەموو ڕێگایەکی قوڵەوە بۆ ئەوەی حازری ئەو شتانە بن کەکەڵک‌و سوودی هەیە بۆیان لەکەڵک‌و سوودەکانی‌حەجە :

١ ـ هەست کردنی موسڵمان بەوە کەئەندامێکە لەو کۆمەڵە گەورەیە ، وە ئەو هەموو موسڵمانانە لە هەرکوێ بژین‌و بەهەر زوبانێ بدوێن‌و هەر جۆرە خوو تەقالیدێکیان بێ‌و هەرشێوەو ڕەنگێکیان هەبێ هەموویان براو هاو باوەڕو پشتیوانی ئەون‌و لە خۆشی‌و ناخۆشی‌دا لەگەڵیان . بێ‌گومان بەمە موسڵمان دڵی بەهێز ئەبێ‌و پشتی قایم ئەبێ‌و خۆی بەلاوە گەورەو خاوەن دەسەڵات ئەبێ‌و دوژمنەکانی ئیسلامی بەلاوە لاوازو بێ دەسەڵات ئەبێ ، وە عەزم‌و ئیرادەی وابەو بەهێز

---

١) الحج ٢٧

ئەبێ کەرێگانەدا بەهیچ پیاو خراپو کافرێك دەست بخاتە ناو ئایینەکەیەوە یا دەست درێژی بکاتە سەر هیچ موسڵمانیك یا سەر هیچ پارچەیەکی وولاتی گەورەی ئیسلامیو هەمیشە بەزوبانی حاڵ ئەڵێ :
« أبي الاسلام لا أب لي سواه .. إذا افتخروا بقيس أو تميم » یانی ئیسلام باوكو نەژادو هۆزمەو بێجگە لە ئیسلام باوکێکی ترم نیە لەوکاتەی خەڵکی شانازی بەتیرەو هۆزو قەیسو تەمیمیەوە ئەکەن .
٢ ـ هەست کردنی موسڵمانە بەوەی کە نیشتمانەکەی ئەو بریتی نیە هەر لەو پارچە زەوییە بچوکەی تیا ئەژیو ئیمپریالیزم سنوورێکی دەست هەڵبەسی بۆ داناوە ( وەکو لە فەرهەنگی دەمارگیریو نەتەوەپەرستییا بریاریدا ) بەڵکو نیشتمانی ئەو گەورەو فراوانەو لە هەر پارچەیەکی سەر زەویدا ناوی خوا ببرێو ووشەی « لاإله الاالله محمد رسول الله » بوترێ ئەوە نیشتمانی ئەوە ، وەکو بوێژی عەرەب ئەڵێ:

« ولست أدري سوى الاسلام لي وطناً
الشرق عندي واقصى الغرب سيان
وكلما ذكر اسم الله في بلد
عدوت أرجاءه من لب أوطاني »

یانی بێجگە لە ئیسلام نیشتمانیکیتر بۆ خۆم شك نابەم ،

وه خورهه‌لات‌و ئه‌وپه‌ری خۆرئاوا به‌لامه‌وه وه‌کو یه‌کن ، وه‌هه‌ر که ناوی ئیسلام برا له‌ وولاتێکا پارچه‌و به‌شه‌کانی به‌کاکڵه‌ی نیشتمانی خۆم دائه‌نێم . وه هه‌موو موسڵمانه‌کان هاو نیشتمانی ئه‌ون‌و پێویسته له‌سه‌ری هه‌وڵبدا بۆ پاراستني مافی هاو نیشتمانی‌یه‌کانی ، وه بۆ پاراســـــتنی ئه‌و نیشتمانه گه‌وره‌یه به هه‌موو به‌شه‌کانیه‌وه ، پێغه‌مبه‌ر دروودی له‌سه‌ر بێ فه‌رموویه : « ئه‌گه‌ر بستێ له خاکی موسـڵمان له خۆرئاوا داگیربکرێ پێویسته له‌سه‌ر موسڵمانه‌کانی خۆرهه‌لات که : یا بیسێننه‌وه یا له پیناوی له ناو بچن».

٣ـ له‌یه‌کتر شاره‌زا بوون‌و ناسیاری له نێوان موسڵمانه‌کانا ، به هۆی حه‌جه‌وه موسڵمانه‌کان یه‌کتری ئه‌ناسن‌و له ئاداب‌و ره‌وشت وخوو پیشه‌و باوه‌کانی یه‌کتری تێ‌ئه‌گه‌ن ، وه‌ئه‌گه‌ر هه‌رکامیان که‌م‌و کوڕی یا خوارو خێچي یاگوێڕان‌و لادانیان له ئیسلام هه‌بێ به‌هۆی ئه‌وانی‌تره‌وه چاره‌ی ئه‌که‌ن‌و ئه‌چنه‌وه سه‌ر دۆخی جارانی راسته‌قینه‌ی ئیسلامه‌تی ، بێجگه له‌وه که چه‌نده‌ها دۆست‌و برا ده‌رو هاورێ دڵسۆزی تایبه‌تی بۆ خویان په‌یدا ئه‌که‌ن .

٤ـ حه‌ج کۆنگره‌یه‌کي گشتی ئیسلامی‌یه‌و نوێنه‌ری هه‌موو وولاته ئیسلامی‌یه‌کانی تیا کۆ ئه‌بێته‌وه ، بێگومان ئه‌مه ئه‌گه‌ر به تێگه‌یشتنه‌وه بکرێ ئه‌بێته هۆ بۆیه‌ك گرتنی موسڵمانان وه‌بۆ به‌ستني په‌یمانی یه‌کیتی

له نێوانیاندا ، وەبەم پێیە ئەتوانن بنەوە بە یەك هێزو یەك وولاتو یەك ئۆردوگا ، وەلە نێوانی خۆر هەلاتو خۆرئاوادا بەرز بنەوە وەبنە کۆمەلێکی سێیەمو سنگ دەرپەڕێنن‌و بکەونە خۆ لە لایەکەوە بۆ بەگژا چون‌و لە ناو بردنی ئەو بیرو باوەڕانەی ماددین‌و دان بە خواو بە ئایین‌و ئیسلامەتی دانانێن‌و لە وولاتە بێگانەکانەوە بە پیلانێ فرێ دراونەتە ناو وولاتە ئیسلامی‌یەکانەوە بۆ سەر لێ شێواندنیان وەبۆ نەهێشتنی قەوارەو دەسەلاتو جوامێری‌یان ، وەگێڕانەوەیان بۆ ئەو وولاتانەی تیایانا هەل قولاون .

وەلە لایەکی‌ترەوە بۆ ناوبژی کردنی ئەو دوو وولاتو دوو ئۆردوگایەی کە لە گوێ قەراغی بیری وێران کەری جەنگی سێیەمی جهانین ، کە بە هۆی چەکە پیس‌و چەپەلو وێران کەرەکانیانەوە ئەیانەوێ یەکسەر جیهان کاول‌و وێران بکەن‌و مرۆڤایەتی لە ناوبەرن‌و ژیان لە سەر زەوی‌دا نەهێلن .

چونکە ناکۆکی‌و نارێکی ئەو دوو ئۆردوگایە ـ لە قولایی‌یەکەیا ـ لە سەر بیرو باوەڕو فیکرە نیە ، بەلکو لە سەر بەرژەوەندی تایبەتی ولە سەر بازاڕو لە سەر مەواددی خاو ولە سەر جێگای دەست خستنی سامانە ، کە ئەویش بریتی‌یە لە وولاتە ئیسلامی‌یەکان ، وەقرەو مرەی ئەوان لە یەکتری تەنیا لە سەر کەلاك یا کەلە پورەکەی ئێمەیەو بەس.

جا ئەگەر وولاتە ئیسلامی‌یەکان یەك بگرن‌و ببنە کیتلەو کومەلیکی سی‌یەم‌و قەوارەیەك بو خویان دروست بکەن ئیتر ئەوان ناتوانن تەمایان تێ‌بکەن وەبە ناچاری لە ناو خویشیانا ریك ئەکەون ، وەدیسان ئەمان — موسلمانەکان — بە هوی هەلگرتنی مەخشەلی ئازاد کەری ئیسلامەوە ئەو دوو وولاتەیش رزگار ئەکەنەوە سەر لە نوێ وەکو جاری پێشو رزگاریان کردن ، وەئەمجارەیش بتەکانیان پێ ئەروخێنن‌و مرۆڤ ئەبەنەوە جێگا بە ریزەکەی کە خوا بۆی داناوە :

« ولقد کرمنا بني آدم [1] » واتە رێزمان لە ئادەمیزاد گرتووە وگەورەمان داناوە .

٥ـ بە هۆی کۆنگرەی حەجەوە موسلمانان ئەتوانن جۆرەها پەیوەندی‌و وابەستە لە نێوان وولاتەکانیانا ببەستن لە روی کۆمەلاتی‌و زانیاری‌و رامیاری‌و ئابووری‌و ... هتد کە ئەمانەیش ئەبنە هۆ بۆ گەیاندنی سوودی جۆر بە جۆر بە وولاتە ئیسلامی‌یەکان بە تێکرایی .

٦ـ وەهەر لە سوودەکانی حەجەکە موسلمانان ( بە دەرسی عەمەلی) هەست ئەکەن بەو یەکسانی‌یە مرۆڤایەتی‌یەی حەج پیشانی ئەدا :

حاجیەکان بە دەولەمەندو هەژارو ژور دەست‌و ژێر دەست‌و گەورە بچوك‌و دورو نزیك‌و پیاوو ژنەوە هەموویان بەبێ جیاوازی

---

١) الاسراء ٧٠

ئەچنە بەرگی سپی ـ وەکو کفن ـ کە ئیحرامەو کەس بەرگ‌و کالاو پێلاوی دوراوی لە بەرا نیەو بە سەری رووت‌و قوتەوە ئەچنە مەکەو عەرەفات‌و شوێنەکانی‌ترو هەر کەسە بە کاری خۆیەوە خەریکەو کەس سەرکەسی ناپەرژێ‌و هەموو ( نفسی نفسی‌یانە ) وکەس لە کەس لە پێش‌ترو زیاتر نیە . وەدیسان نیشانەیەکی رۆژی رەستاخیز ( قیامەت ) دێتە بەر چاویان‌و ئەچەسپێتە دلیانەوە ، وەتێ ئەگەن‌و بۆیان روون ئەبێتەوەو خۆیاني بۆ ئامادە ئەکەن .

٧ـ هەر لە سوودەکانی حەجە کە بە هۆی راهاتن‌و ئارام‌گرتنەوە لە سەر ئەو هەموو نارەحەتی‌و زەحمەت‌و ئێش‌و ئازارو برسێتی‌و تینوێتی شەبەینو خونی‌و ئـاوارەیی‌و روتی‌و قوتی‌یەوە کە تووشي حاجی ئەبێ لە لایەکەوە ، وەلە لایەکی‌ترەوە بە هۆی بینيني ئەو جێگاو رێگاو ئەو شوێنانەی پێغەمەرو یارەکانی جەنگیان تیا کردووە وخوێنیان تیا رشتووەو خەباتیان تیا کردووەو قوربانی تیا داوەو رزگاریان کردووە وبە روناکی ئیسلام رووناکیان کردوەتەوە .

حاجی بە هۆی ئەمـانەوە بیر ئەکەنەوەو ئامادە ئەبن‌و غیرەت ئەیانگرێ‌و ئەبنە بلیمەت‌و پالەوان‌و ئەکەونە هەول‌و تێ‌کۆشان ـــ وەکو موسلمانە پێشووەکان ـــ بۆ گەرانەوەی دەستەلاتی‌ئیسلام بۆ شوێنەوارەکەی خۆی ونایەلن کافرو پیس‌و چەپەلەکان دەستي ناپاکانە بکێشن بۆ ناو

قەلای ئیســـلامەتی ، یا بە ناو دڵو برواو ناموس یا بۆ کەلەپوورو سامانی موسڵمانەکان ، وەئەکەونە خەریك بوون بۆ بەرز کردنەوەی ئالاّی ئیسلام ، ومەشخەڵی ئیسلام هەڵ ئەگرنو سەر زەوی پێ ڕۆشن ورزگاری ئەکەنەوە وەکو جاری پێشو .

بێجگە لە مانەیش چەند کەڵكو سودی‌تر هەیە کە لەم نامیلکەیەدا بە درێژی بۆ باس ناشێن وەکو : پەیوەست کردنی دڵ بە خواوەو تازە کردنەوەی پەیمانی ئیســـلامەتیو بەندەیەتی بۆ خوای گەورەو پەروەردگار وەبەستني پەیمانی نوێ لە گەڵ خواو پێغەمەرا ، یا وەکو پاك کردنەوەو پالفتە کردنو ڕازانەوەی دەستو دەمو گیانو دڵو دەووون وەزیندو بوونەوەو بوژانەوەی هەستي خۆشەویستيو برایەتیو هاری کاريو یـارمەتيو خۆنەویستنو وێنەیان لە نێواني موسڵمانانا ، وەکو خۆ ساخ کردنەوە بە سەر خواداو تەوبەو پەشیماني ڕاستەقینە . ئەمانەو زۆري‌تر کەڵكو سوودی حەجن — بەگوێرەی ئەو ئەندازە تێگەیشتنەی ئێمە بومان دەرکەوتووە ـ بەلاّم بە داخەوە ـ موسڵمانەکاني ئەم تافە دوایيیانە لەم ماناو مەبەستو سوودانە خۆیان هەڵە ئەکەنو لێیان نزیك نابنەوە ، وەکو هەر نەیان زانن . یا نەیان بیستبن ، یا بە خەویش نەیان دیبن . ئەمەیش نەگبەتيیەکی گەورەیە بۆ موسڵمانان وە وولاّتەکەیان .

## تێبینی کردن لە حەج کردنا :

خوای گەورە حەجی لەسەر موسلمانان پێویست گێراوەو قورئان ئەفەرموێ : « ولله على الناس حج البيت من استطاع إليه سبيلا ١ » واتە خوا حەجی کەعبەی لەسەر ئادەمیزادەکان پێویست کردووە بەمەرجێ توانای ڕێگەو جێگەکەیان هەبێ . وپێغەمەر ( درووودی لەسەر بێ ) لە زۆر فەرموودەیان باسی پێویستی حەجی کردووەو کردویتی بەیەکێ لە بەش‌و پایەکانی ئیسلام وە لە زۆر فەرموودەدا باسی گەورەیی‌و خێرو بێری حەجی کردووەو ئەفەرموی : « حەجی چاك‌و پاك بێجگە لە بەهەشت پاداشی تری نیە » وە ئەفەرموی : « هەرکەسێ حەجی کردو لە سنوور دەرنەچوو تیایا : لەگوناهەکانی پاك ئەبێتەوە وەکو ڕۆژی لە دایك بوونی » وە ئەفەرموێ : « هەرکەس حەجی لەسەر بێ‌و ئەی‌کات لە سەرەمەرگا فریشتە دێنە سەری‌و پێی ئەڵێن: پیت خۆشە بە گاوری بمری یا بە جوولەکەیی » واتە لە موسڵمانیتی دەر ئەچی بەحەج نەکردن.

حەج وەکو پەرستنەکانی تر چەندە مەرج‌و بەش‌و پێویستی هەیە وەکو ئیحرام بەستن‌و گەڕان بەدەوری کەعبەداو چونە عەرەفات‌و میناو موزدەلیفەو بەرد باران کردنی میلەکان‌و ... هتد .

وە بێجگە لەمانەیش زیارەتی مەرقەدە پیرۆزەکەی پێغەمەرو

---

١) آل‌عمران ٩٧

خزم‌و یاره‌کانی‌و پیاوه گه‌وره ئایینی‌یه‌کانی تر که ده‌ستی دیاری‌یان بووه له ئیسلاما وه له کتێبه فیقهی‌یه‌کان به درێژی باسی ئه‌مانه‌کراوه‌و ڕۆشن کراونه‌ته‌وه . لێره‌دا ئه‌وانه‌ی له خورماکه‌ی خۆرئاوایان خواردووه‌و به‌شیری خاچی‌یه‌کان‌و زایۆنیزمی‌یه‌کان گۆش‌کراون ، یاخو کوێرانه شوێنیان که‌وتون وه تۆزو خولی بێگانه به‌رچاوی گرتوون ئه‌لێن : حه‌ج چی‌یه ؟ یا بۆچی ئه‌کرێ ؟ بوچی ئه‌و پاره جوانه ئه‌به‌ن بۆ بیگانه؟ یا ئه‌بێ سوودی حه‌ج‌چی‌بێ؟ وه ئه‌و جۆره کارانه‌ی له حه‌جا ئه‌کرێن مانایان چی‌یه ؟ ئه‌م جۆره کاروبارانه ته‌نیا کۆنه‌په‌رستی‌و خه‌رافاتن وه له‌گه‌ل تاقی زه‌ره‌و هایدرۆجین‌و گه‌ران به‌ئاسمانه‌کانا رێك ناکه‌وێ .

بۆ روون‌کردنه‌وه‌ی ئه‌م مه‌به‌سته وه‌ره له‌گه‌لم ( ئه‌ی خوینده‌واری به‌رێز ) با پیکه‌وه سه‌رێك له چه‌رخی زه‌ره‌و ئاسمان دوزیتی بده‌ین :

له سالی « ۱۹۱۷ » ی زایین‌دا له وولاتی رووسیا شورش به‌سه‌ر قه‌یسه‌را کراو کوماری یه‌کیتی سوفیتی دامه‌زرا ، گه‌لی ڕوسیاو سوفیاتی له ژیر چه‌پوکی ده‌ره‌به‌گی ده‌رهینراو فری درایه ژیر کوت‌و زنجیرو دیواری پولایینی شیوعیتی‌یه‌وه که‌به‌هیچ جوری که‌س نه‌توانی به‌پیچه‌وانه‌ی یاسای وولات هه‌ناسه بدات له مالی خویشیا ، وه به‌سه‌دان جار زیاتر له ده‌وری پیشوی سه‌ربه‌ستی زه‌وت کرا . له‌گه‌ل ئه‌مه‌شا بو بیره‌وه‌ری

ئەو رۆژو کاتە هەموو ساڵێ‌و لە هەموو لایەکی جیهانەوە چەند ملیون مروف ئەڕۆن‌و بەشداری لەو ئاهەنگەدا ئەکەن‌و بەدەیانی هەزار ملیون پارەی تیا خەرج ئەکری .

وە هەروەها بو شورشی چواردەی گەلاویژی فەرەنسە وە شورشی ئەمەریکا ، وە هەروەها لە هەر وولاتیکی ترا هەرشتیکی بەگویرەی شوێنەکە گرنگ روی دابی بیرەوەری یەکەی یاد ئەکریتەوەو لەزورلاوە خەلکی بو ئەرواو سامان‌و مالی تیابەخت ئەکرێ .

ئایا ئەمانە هەموو نیشانەی پێش‌کەوتن‌و شارستانێتی‌و سەرکەوتنن، بەلاّم حەج کۆنەپەرستی‌یە ؟ وە ئایا ئەو پارەیەی بۆ حەج ئەبرێ‌و لەو ڕیگەدا خەرج ئەکرێ بو بیگانەیەو زەرەرو زیانە ، بەلاّم بۆ ئەم ئاهەنگ‌و وولاتانەی تر هەرچی پارەیەك ببرێ‌و خەرج بکرێ راستەو جێگەی خۆیەتی ؟ لەگەڵ ئەوەدا کە حەج بەگوێرەی عەقلیەتی شارستانێتی تازە بیرەوەری یەکەو هەموو ساڵێ یادی ئەو کارە گرنگانەی تیا ئەکرێتەوە کە لەو کات‌و شوێنانەدا کراون‌و رویان داوە : چونکە لەو شاری مەکەداو لەو وولاتی چۆلی دیمەداو لەو دەشتی نیو دورگەی عەرەبی‌یەدا خوای گەورە پیشەواو پێغەمەرێکی وەکو محمدی کوری عبداللّهی ناردو چرای ئازادی‌و مەشخەڵی رزگاری دایە دەست بۆ رزگارکردنی مرۆڤ بەتەواوی ، لە کاتێکا کەمروف پێویست ترین

کانی بوو بۆ ئەوەی پێشەوایەکی بۆ بێو لە چاڵی ڕوخاندنو لە ناوچونا دەری بێنێ ، وە ئەو پێغەمەرەیش « درووودی لەســـەربێ » بەهەمو دڵسۆزی‌یەکەوە شانی‌دایە بەرو لە پەنای خواوە توانی مرۆڤەکان دەربێنێو سەریان بخاو پێشیان بخاو یان باتەوە جێگاکەی خۆیان ، وە بەم کارە گەورەیە لە مەکەو لە کەعبەوە دەستی پێ‌کردو لەمەدینەدا کۆتـایی پێ‌هاتو هەموو ڕەنگو ڕێسـێکی ژێك خرا ، مرۆڤەکانی لە نەفامی‌و نەزانینەوە هێنایە ناو زانیاری ، وە لە تاریکی‌یـەوە بۆ ڕووناکی وە لە دوژمنایەتی‌یەوە بۆ دۆستایەتی‌و برایەتی ، وەلە ڕق‌و قینەوە بۆ خۆشەویستی وە لە جـەورو زوڵمەوە بۆ عەدالەتو داد پەروەری ، وە لە پشێوی‌و گێرەشێوی‌یەوە بۆ یاساو نەریتو ئاشتی‌و ئاســـایش‌و هێمنی ، وە لە خراپکاری‌یەوە بۆ چاکە کردن‌و چارەسەری . بەم ڕەنگە هەڵگەڕانەوە « انقلاب » یەکی تەواوو گشتی کردو مروڤ بردە سەر پۆپەی پیاوەتی‌و جوامێری‌و هەستی مروڤایەتی تیا ڕواندن و لەسـەر ئەمانەوە باشترین دەوڵەت بەرپابوو بە شیرینترین دەســـتورو ڕژێمەوە . وە جوانترین شارستانێتی دامەزرا کەماددەو گیان تیایا بەشداربێ ، وەئەم شارستانیتی‌یە ماددی‌یەی ئێستای خۆراوا لەسەر هەندێ لە بنودەکانی ئەو دامەزراون.

ئایا ئەو شوێن جێگایانەی ئەم ڕووداوە گرنگانەیان تیا پەیدابووە شایانی ئەوەنین کە هەمیشە پۆل پۆل مرۆڤەکان بڕۆن بو ســەر لێ‌دان‌و

دیدەنی کردنیان ؟ وە ئایا ئەو پێغەمبەرو یارانەی ئـەم خزمەتە گەورەیەیان پێشکەش بەمرۆڤایەتی کردووە هەقی خۆیان نیە هەمووکاتی بەگوێرەی توانا مەردم بچی بۆ خزمەتیانو سوپاسیان بکاو زیارەتیان بکا ؟ یا ئایا بیرەوەری ئەو کاتە کۆنەپەرستی‌یە با زور گرنگیش بی بەلام بیرەوەری ئیستا پێشکەوتن و شارستانیتی‌یە ؟ ئایا ئەمە بانیکەو دوو هەوا ؟!.

بەم پێیە بۆ هەموو کەس روون بووە کە حەج کردنو رۆیشتن بۆ ئەو شوێنو جێگایانە شتێکی راستو کارێکی جوانەو پر بە پێستی کاتی زەرەو هایدروجینە .

ئینجا ماوەتەوە باسی هەندی لەو شتانە بکەین کەلە حەجا ئەکرێنو مرۆڤ لە مەبەستو قولایی‌و حیکمەتیان تێ‌ناگا . با بو ئەم باسە سەرێك بدەین لە زانای بەرزو باوەر پی‌کراوی ئیسلامی سەردەستەی مامۆستایان « ئیمامی غەزالی » خوای لی‌رازی بی لەکتیبی « احیاء علوم الدین » دا بەرگی یەکەم لاپەرە ( ٢٧٣ ) چاپی میسر کە ئەفەرموێ :

« خوای پەروەردگار گەورەیی لەگەل ئومەتی ئیسلاما نواند ، بەم رەنگە حەجی بۆکرد بە رهبانی‌یەت وەئەو مالە کۆنـە «کعبە» یە گەورەکردو دای‌نا بەمالی‌خوا ، وەکردی بەروگە «قبلة» بوموسلمانەکان

وەدەورو بەرەکەی کرد بە حەرەمی ئەو ماڵە گەورەو بەڕێزە ، وەعەرەفاتی‌کرد بە پلوسکێ بۆ حەوزی ئەو ماڵە ، وەبە توندی باسی حورمەتی جێگاکەی کرد ، وەگیاندارو ڕەوگەکانی قەدەغەو یاساغ‌کرد لە هەمو دەست بۆدرێژکردنێ وەئەو ماڵەی وەکو پاشای گەورەداناو داوای لە خەڵکی کرد بێن بۆلای و دیدەنی بکەن و بێنەخزمەتی لە هەموو ڕێگاو چەم و شیوێ‌کەوە بە تۆزو خۆڵو ماندویەتی و بەگەردن کەچی‌یەوە ، وەبە زەلیلی و بەندایەتی و کۆیلەیی خۆیان دەربڕن لەگەڵ دان‌نانیانا بەوە کە خوای پەروەردگار گەورەترە لەوەی بچێتە ناو خانو یەکەوە یا لە ناو شارێکابی .

« ئەمەیش بۆئەوە زیاتر بەندەیی و بچوکی‌یان بۆخوا دەرکەوێ وەباشترین نیشانەبێ لە سەر مل ڕاکیشانو گەردن‌کەچی‌و گوێڕایەڵی‌یان بو خوای‌گەورە ». « وەهەر لەبەر ئەمە چەند ئیش و کارێکی ئەوتۆی داوە بەسەریانا کە مرۆڤ خۆی پێ‌یانەوەنیە و دڵ و ژیری لە ماناکە یان‌تێ‌ناگات » : « وەکو بەردەبارانی چەند قولەو میلێك و گەڕان بە دەوری کەعبەدا و هاتوچۆ کردن لە نیوان سەفاو مەروەداو .... هتد» « ئەمانەو ڕێنەیان چونکە دەروون بەشی تیادانیە و عەقڵ و ڕێی لە ماناکەیان ناکەوێ و مرۆف خۆی پێ‌یانەوە نیە ، بەجێ‌هینانیان تەنیا بریتی نەبێ لە بەندایەتی و گوێ ڕایەڵی و گەردن‌کەچی ..» « چونکە هەر

شتێ عەقڵ لێی تێگەیی و دەروون خۆی بوو پیوەی ، سروشت ئارەزویی و داخوازی بۆ ئەکا و بەوە بەندایەتی ڕاستەقینە دەرناکەوێ ، « بۆیە پێغەمەری خوا ئەی فەرموو : « لبیك بۆحەجی ڕاستەقینە کە پەرستن و بەندایەتییە١ » وەئەم فەرمایشەی بۆهیچ خواپەرستێکی تر نەئەفەرموو وە زیاتر لەمە بەدرێژو بەوردی لێی دواوە ئەگەر ئارەزو ئەکەی فەرمو بۆ خزمەتی « أحياء العلوم » .

١) أحياء علوم الدين جـ١ ص٢٣٣

# کوتایی

بەم پێیە ـ لە پەنای خواوە ـ توانیمان لەم نامیلکەیەدا :

١ـــ ماناى فەرموودەى پایەکان «أرکان»ی ئیسلام روون بکەینەوە، وەهـــەندێ لەکاکڵەو مەبەس و وابەستەکانی بخەینە پێش چاوی براو خوشکە خوێندەوارەکانمان ، وەهەندێ لەو تۆزوگەردانە بتەکێنێ کەلە رووی شیرین فەرمودەکە نیشتبو ، بۆ ئەوەی ایتر خوێندەواری بەرێز بە سادەیی سەیری فەرموودەکەنەکا ، یا بەهۆیەوە سەری لێ تێك نەچێ وەبزانێ کەچۆن ئیسلام ئەم پێنج بەشەیە یالەسەر ئەم پێنجە دارێژراوە

٢ـــ وەپیشانی بدەین کەئەم پێنج پایەو کردەوەیە هەر یەکەیان بریتییە لە جۆرە راهێنان و پەروەرشێ کە مرۆڤ ئامادە ئەکەن بۆ هەلگرتنی ئـالآی ئیسلام ، وەبۆ بەجێ هێنـانی ئەحکام و فەرمانەکانی ئیسلام وەبۆ تەتبیق کردنی بەرنامەکەی بەسەر مرۆڤا .

٣ـــ دەرمان خست کە ئیسلام بیروباوەر «مبدأ»ە وەبەهیچ کلۆجێ ناگونجێ بەش و پارچەکانی لەیەك جیابکرێنەوە و بەش و توش بکرێن وەهیچی لەوانی تری جیاناکرێتەوە ، وەیا ساکانی هەموویان : رەوشتی رامیاری، کۆمەلآیەتی ، ئابووری، پەروەردەیی ، زانیاری، دەروونیو گیانی و .. هتد .

هەموویان دەستیان لە ملی یەکایەو بە هەموویانەوە ئیسلامیان
دروست کردووەو هیچیان بەبێ ئەوانی‌تر ناژین‌و پێك نایەن ، وەقورئان
هەموویان کۆ ئەکاتەوەو یەکیان ئەخاو ئەیان کا بە یەك بەرنامەو
ئەفەرموێ : « ورضيت لكم الاسلام ديناً ١ » .

واتە ڕازیم بۆ ئیوە کە ئیسلام بەرنامەو پرۆگرامتان بێ وەخوایش
لە زۆری دڵو مەبەستەوەیەو ئەزانێ کە مەبەستم تێگەیشتنی موسڵمانانە
لە گیانی خاوێنی ئایینە بێگەردەکەیان ، وەهەر لە خوا ئەپارێمەوە کە
دڵمان ڕوناك بکاتەوەو بمان خاتەوە سەر شەقامە ڕاست‌و فراوانەکەی
ئیسلامی پیرۆزو ببینەوە بە موسڵمان‌و بچینەوە جێگاکەی خۆمان لە سەر
زەویدا « ويومئذ يفرح المؤمنون بنصر الله ويقولون متى هو قل عسى
أن يكون قريباً » .

وەتکام لە خوێندەوارەکان ئەوەیە ئەگەر هەڵەو ناڕاستی‌یەکیان دی
ڕاستی بکەنەوە چونکە ئادەمیزاد جێگای هەڵەیە ، وەهەر کەسە بەپێی
توانای خۆی ئەدوێ .

« ربنا تقبل منا إنك أنت السميع العليم » وصلى الله على سيدنا
محمد وعلى آله وصحابته وأتباعهم آمين .

سوپاس بۆ خوا تەواو بوو ڕۆژی١٢/٤/١٩٦٧م ڕیکەوتی ١٣٨٧/١/٢هـ

---

١) المائدة ٣

# ناوەڕۆك

لاپەرە


١) سەرەتا ٣

٢) پایەی یەکەم لە ئیسلاما [ شایەتمان ] ٨

أ : مانای شایەتمان .

ب : گەڕانەوەیەك بۆسەر مانای شایەتمان .

ج : ئیشي موسڵمان .

د : سوودي باوەڕ .

ه : چەند تێبینیەك : یەکەم ، دووەم ، سێیەم .

و : مێژوی تەریقەت .

٣) پایەی دووهەم لە ئیسلاما [ نوێژە ] ٤٧

أ : شێوەی بەجێهێناني نوێژ .

ب : تێبینی .

لاپەرە


٤) پایەی ٣سەیەم لە ئیسلاما [ زەکات دانە ] ٦٥

أ : پلەی زەکات لە یاسادا .

ب : رەخنەو ولامی .

ج : یاسای ئابووری لە ئیسلاما : مەبدەئي یەکەم ، دووەم ، ٣سەیەم ، چوارەم ، پێنجەم ، شەشەم ، حەوتەم ، هەشتەم ، نۆیەم ، دەیەم (زەکاتە) .

٥) پایەی چوارەم لە ئیسلاما [ ڕۆژوگرتنە ] ٨١

أ : ڕۆژو لە تەرازوی زانیاریدا .

ب : بۆچی ڕۆژو ئەگرین .

ج : سزای ڕۆژو نەگر .

٦) پایەي پێنجەم لە ئیسلاما [ حەج کردنە ] ٩٨

أ : سوودەکانی حەج .

ب : تێبینی کردن لە حەج کردنا .

٧) کۆتایی ١١٣ ، ١١٤